وەهبی وەققاس ئۆغلوو

بینجەرچاپ

2

# یاداشتنامەی مامۆستایەک





و: د.رانا ئەحمەد





ناوی کتێب: یاداشتنامەی مامۆستایەك

بەرگی دووەم

نووسەر: وەهبی وەققاس ئۆغلوو

وەرگێڕ: د. زانا ئەحمەد

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٦٣٧)ی ساڵی ٢٠٠٩ ی پێدراوە




بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا - سلێمانی / شەقامی پیرەمێرد
0770 358 7100 - 0750 106 9589 www.aramediacenter.com | ara.m@hotmail.com

# چەند پەیڤێك

من باخێکی دڵگیرم هەیە، کە هەر دەڵێی باخێکە لە باخەکانی بەهەشت. گوڵەکانی ئەو باخە نموونەیان نییە. گوڵەباخ و مێخەکی تا بڵێی پاك و جوانن...

ناتوانم باخەکەم بە هیچ باخێکی دونیا بدەم. چونکە لەم باخەی مندا، بەردەوام گوڵی بیر و زانست دەپشکوون.

لەم پەرتووکەشدا، چەند چەپکێك لەو گوڵە جوانانەتان پێشکەش دەکەم. یەك لە بەرهەمەکانی ئەو باخەم –واتە قوتابخانە و پۆلەکانم– ئەم لاپەڕانەن. چونکە قوتابییە دڵپاك و خاوەن هەست و باوەڕەکانم پرسییان، منیش وەڵامم دانەوە.

***

باخەکەی من، گەلێك فراوانە... ئەم باخی بەهەشتە، هێندەی وڵاتەکەمانە... چونکە قوتابیی وام هەن، کە نەمدیتوون و ناویشم نەبیستوون. لە هەموو لایەکی وڵاتەوە بۆم دەنووسن، داوای درێژە دان بەم یادداشتنامەیە دەکەن.

***

بەتایبــەتی بــەهۆی خواســت و وەفــای قوتابییــە كۆنــە، كــۆن نەبووەكانمــەوە، ئــەم یادداشــتنامانە درێــژەیان دەبێـت. چـونكە بـۆ لەمەودوا، تەنها لە ڕێـی دێڕەكـان و ڕووپـەڕی لاپەڕەكانـەوە دەتـوانم پێیان بگەم...

***

لە ئێستاوە چاوەڕوانی پرسیاری قوتابییە دوورەكانمم. بـە هیـوای بەیـەك گەیشـتنەوە لـە وەڵام دانـەوەی پرسـیارە نوێكـان لـە سـێیەم بەرگی «یادداشتنامە»دا. لە كانگای دڵـەوە، سـڵاو و خۆشەویسـتیتان پێشكەش دەكەم.

لە دەورتان بگەڕێم.

وەهبی وەققاس ئۆغڵوو
٣ی كانوونی دووەمی ١٩٨٥
باخچەل ئێڤلەر





# کەس نییە دینی نەبێت

## نامەیەکی سامدار

گەر بە دونیادا بگەڕێن، ڕەنگە شاری بێ شوورە و وێژە و یاسا و سامان بدۆزنەوە، بەڵام شارێکی بێ پەرستراو و پەرستگە نادۆزنەوە.

پلووتارک

گەر لێم بپرسن کامەیە ئەو نامەیەی هەرگیز لە یادی ناکەیت، یەکسەر چەند نامەیەك بە خەیاڵمدا دێن. یەك دووانێکیان بەهۆی سامدارییانەوە لە بیرم نەکردوون. تۆ بڵێی ئەو نامانە چ نامەگەلێك بن، کە ئاوا سامدار بن و بەو هۆیەشەوە بۆ چەندین ساڵ لەبیر نەچووبنەوە؟!

"– ئەرێ ئێوەش یادگاریی واتان هەیە؟"

ئەو پۆلەی ئەم پرسیارەم ڕووبەڕوو کردەوە، کڕ و کپ بوو، وەك ئەوەی بیری لای شتێکی تر بێت و نەیەوێت بیری پەرش و بڵاو ببێتەوە. کە کەس دەستی هەڵنەبڕی، من درێژەم پێدا:

– دە با یەك لەو نامانەتان بۆ بخوێنمەوە، کە مۆتەکە ئاسا ترسێنەرە و بە ڕامانتان دێنێت.

هەموویان پاڵیان دایەوە و هەناسەیەکی قووڵیان هەڵمژی، سەرنجەکانیان کۆکردەوە. چاوەکانیان ئاماژەیان بەوە دەدا کە پەلەیانە. نامەکەم کردەوە و کەوتمە خوێندنەوەی:

پاریس، ٢١ی تشرینی دووەمی ١٩٦١

"دایە و بابەی خۆشەویستم،

دەزانم بە خوێندنەوەی ئەم نامەیەم دڵتەنگ دەبن. ئەوەش دەزانم کە ڕەنجاون لەوەی چەند مانگێك بوو سۆراغم نەبوو. بەڵام چی بکەم، لەوە زیاترم پێنەدەکرا. هیوادارم بمبوورن و بیانووم بۆ بێننەوە.

دایە گیان، بابە گیان!

من ئیدی وازم لە ئاینی ئیسلام هێناوە و بوومە بە فەلە. ئەگەر لەمەشدا گوناهبار بم، بزانن تەواوی ئەو گوناهە ئۆباڵی بە ئەستۆی ئێوەیە، چونکە ئێوە فێری ئاینەکەمتان نەکردبووم. هەر ئەوەندە بوو دەمزانی موسوڵمانم و تەواو...

بەڵام (موسوڵمانێتی چییە؟ چۆنە؟ پێغەمبەرەکەم کێیە؟ کەسێکی چۆنە؟ قورئان چۆن کتێبێکە و باسی چی دەکات؟ لە موسوڵمانێتیدا پەرستشەکان چۆنن و بۆچی ئەنجام دەدرێن؟)، گشت ئەمانە، لای من شتانی نەزانراو بوون.

کە هاتمە ئێرەش، بینیم زۆربەی زۆری فەڕەنساییەکان دیندارن. لە هەموو ماڵێکدا چەند وێنەیەکی عیسا پێغەمبەر و مەریەم (سەلامی خوایان لەسەر بێ) هەیە. کە لەسەر خوان دادەنیشن، سەرەتا نزا دەکەن. منیش لە دۆش دامان بە دیاریانەوە، شتێکی دیکەم پێنەدەکرا.

پرسیاری زۆریان دەربارەی ئاین، باوەڕ، خودا، پێغەمبەر، قورئان و پەرستشەکان لێدەکردم.



● باوەڕی لاواز و بێپیشە، وەك چرای بێشووشە وایە. هەر بایەکی لاوازی گومان هەڵبکات، ئاگرەکەی دەکەوێتە جووڵە و ئەملاولا کردن. بە بایەکی بەهێزیش، دوور نییە بکوژێتەوە.

منیش نەمدەتوانی وەڵامی هیچیان بدەمەوە، چونکە ئێوە فێری ئەمانەتان نەکردبووم. تەنانەت لە وڵاتەکەی من، دینداریی نەنگی بوو. بۆ نموونە: لە قۆناغی دواناوەندیدا، کە مامۆستاکان دەهاتنە ژوورەوە، سەرەتا باسێکی ئەوەیان دەکرد کە دینداریی دەمارگیری و دواکەوتوویيە، ئینجا دەستیان بە وانە وتنەوە دەکرد. خۆ ئەگەر یەکێکمان باسی ئاینی بکردایە، مامۆستا و قوتابییەکان دەکەوتنە گاڵتە پێکردنی و دەیانوت: "کاکەی دەمارگیر! های لە چ سەدەیەکدا؟"... ڕۆژووگرتن تاوان و نوێژکردن شوورەیی بوو.

بەڵام لێرە، بارودۆخەکە تەواو پێچەوانە بوو. ئای چەندە هەڵخەڵەتاو بووین کە وامان دەزانی ئەورووپاییەکان بێدینن. بێدینیمان بە پێشکەوتوویی و دینداریشمان بە دواکەوتوویی دەزانی. ئای ئەمە چەند هەڵەیە!... لێرە هەموو کەسێك باسی دین و ئیمان و عیسا دەکات، کەس بێدینەکانی خۆش ناوێت، لە باخەڵی هەمووانیدا ئینجیلێك هەیە.

لە بەرانبەر ئەمانەدا، لە ناخی خۆمدا هەستم بە بۆشاییەك دەکرد. زۆربەی زۆری فەلەکان خەریکی پەرستش بوون. منیش نە لە دینەکەی خۆمم دەزانی نە لە هینەکەی ئەوان.

ورده ورده مەراقی شارەزا بوون لە ئاینی مەسیحییەت ناخی تەنیم. ئەوەبوو فێربووم و بووم بە فەلە. لەمەودوا، کڵێسا تێچووی خوێندنەکەم لە ئەستۆ دەگرێت.

لـەمڕۆ بـەدواوە، حـەز دەکـەن نامـەم بـۆ بنێـرن، حـەزیش ناکـەن مـەینێرن، کـەیفی خۆتانـە. بـەڵام دووبـارەی دەکەمـەوە: ئەگـەر بـە وازهێنـان لـە ئاینەکـەم گونـاهێکم کردبێـت، تـەواوی گوناهەکـە لـە ئەستۆی ئێوەدایە. خودا لێتان خۆش بێت..."

***

که نامەکە تەواو بوو، لەو پۆلەی کە هەناسەی لەخۆبڕیبوو و نقەی لێوە نەدەهات، ژاوەژاو دروست بـوو. هـەموو قوتابییـەکان دەسـتیان بەرز کردبووەوە. من، لەبەر ئەوەی هەستم بەو باهۆزە دەکرد کـە لـە نـاو دڵـە پاکەکانیانـدا هـەڵیکردبوو، ویسـتم سـەرەتا هەنـدێك ڕوونکردنەوەیان بدەمێ. وتم:

- ڕۆڵەکانم! سەرەتا دەمەوێت سەرنجتان بۆ لای مێژووی نامەکـە ڕابکێشم. هی نزیکەی نیو سەدە لەمەوبەرە، وا نییە؟ مانای وایە لـەو دەورانەدا و لەم وڵاتەی ئێمەدا، نەوەیەك هەبووە کە نە لە خێزان و نە لە قوتابخانە پەروەردەی ئاینیی وەرنەگرتووە. ئێوە ئێستا بـەختتان هەیە کە لە قوتابخانەدا وانەی ئاینتان هەیە. هیوادارم زۆر بەدوور بـن لەو دۆخەی خاوەنی ئەم نامەیە تێی کەوتووە.

کەواتە یەکەمین پەندێك کە لەم نامەیە وەریدەگرن، ئەوەیـە کـە کەسێك نییە دینی نەبێت. ئەوەی شارەزای دینەکەی نەبێت، دەگلێتە سـەر بیروبـاوەڕێکی دی. یـانیش ئـەوەتا بێبـاوەڕی دەکاتـە ئـەو

باوەڕەی، کە باوەڕی پێدێنێت. باوەڕ بە ماددە، پارە یان ئایدیۆلۆژیایەك دەهێنێت و دەیکات بە ئاینی خۆی. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە تاك و کۆمەڵگای بێباوەڕ نییە.

دووەم خاڵی گرنگیش، گرنگیی ئەم وانەی ئایینەیە کە پێتانی دەڵێینەوە. ئەمە وێڕای تێگەیشتن لەوەی کە ئەوەی ئەم وانەیە ناخوێنێت، چەندە لەژێر هەڕەشەی کەوتنە باری خراپ و دژواردایە. دە با نرخی ئەم وانەیە بزانین و هەوڵ بدەین زیاتر لێی تێبگەین و لێی سوودمەند ببین.

بۆیە هەر پرسیارێك بوو بە ماخۆلانی مێشکتان، بیپرسن. هەوڵ بدەن باشتر و زیاتر تێبگەن. با باوەڕتان بە زانینەوە بێت. ئەو باوەڕەی پشت ئەستوور نەبێت بە زانیارییەك کە تۆکمە بێت و لەگەڵ عەقڵدا یەك بگرێتەوە، ڕەنگە زۆر بەزوویی وەربگەڕێت. باوەڕی لاواز و ڕەگ دانەکوتاو لە چرای بێشووشە دەچێت. لەگەڵ هەڵکردنی نەرمە بایەکدا ئاگرەکەی دەکەوێتە لەرزە. بە بایەکی بەهێزیش دەکوژێتەوە. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا ئەو بایە دەستکردانەی دەیانەوێت باوەڕ لاواز بکەن گەلێك زۆرن. ناحەزانی باوەڕ زۆر و زەبەندن. لەم گۆشەنیگایەوە، زۆر پێویستمان بەو زانستانە هەیە کە باوەڕەکەمان دەسەلمێنن. پێویستە بەردەوام بیرمان لای بەهێز کردنی باوەڕ بێت و لە هەوڵی بەدەست هێنانی زانستەکانیدا بین.

وانەی ئاین، ئەم هەلـەتان بـۆ دەڕەخسـێنێت. هـەر پرسـیارێك بـە مێشكتاندا هات بیكەن و شـەرم مەكـەن، چونكە هەوڵدانی مرۆڤـ بـۆ بەدەست هێنانی شارەزایی لە ئاینەكـەی نـە نەنگییـە و نـە گونـاهـ... بەڵكو بەپێچەوانەوە ئەوە نەنگی و گوناهە كە لە ترسی ئـەوەی داخـۆ دەبێـت چ لێكدانەوەیـەكی بـۆ بكرێـت، ئـەو پرسـیارەی لات دروسـت دەبێـت، نەیپرسـیت. ئـەو پرسـیارانەی كـە نـاكرێن و وەڵامـەكانیان بەدەسـت نـاخرێن، لەگـەڵ تێپـەڕ بـوونی كاتـدا، هـەر یەكـەیان وەك مێرووییەكی مەعنەویی هێز پەیدا دەكەن و دەكەونە لێدانی باوەڕمان.

***



# هەموو شتێك خودا دروستی كردووە

## ئەی خودا كێ...؟

### ئەو پرسیارەی دەبێتە ماخۆلانی مێشك

لە پشووی دوای ئەو وانەیەدا بووم. بینیم یەكێك لە قوتابییەكان لەبەردەم ژووری مامۆستایاندا بە سڵەمین و دان بەخۆ نەگرییەوە وەستاوە. كە گەیشتمە لای، ئەو خۆی دوور خستەوە. بەتەواوی سەرنجی ڕاكێشابووم. بەدرێژایی ئەو ماوەی پشووە، بە بەردەم دەرگا نیوە كراوەكەدا هەر دەهات و دەچوو، سەیرێكی دەكرد و خۆی ون دەكردەوە. بانگیم كرد، وەستا. هەر وا بە سڵەمین و خۆڕانەگرییەوە گەڕایەوە.

وتم:

- جەلال! وا دیارە دەتەوێت شتێکم پێ بڵێیت، دەی بیڵێ.

بەڵام ئەو وەك ئەوەی هەناسەی تەنگ بووبێ، بە هەناسەبڕکێ و شڵەژاوییەوە وتی:

- نا، مامۆستا! هیچ پرسیارێکم نییە.

من مکوڕ بووم لەسەری:

- با، دەبێ بیپرسیت و منیش وەڵامت بدەمەوە. کەمێك لەمەوبەریش لە پۆلدا وتم کە پرسین و فێربوون نەنگی نییە. بوونی مەراق شتێکی جوانە. چونکە مەراق باوکی فێربوونە. دەی پرسیارەکەت بکە بزانم...

ئەو وەك بڵێی گوێی بە من نەدەدا، بەڵکو گوێی بەو زریانە دەدا کە لە ناخیدا هەڵی کردبوو. وەك لە هەڵسوکەوتیشیدا دیار بوو، خوا خوای بوو ساتێك زووتر لە دەستم ڕزگاری ببێت. کە دەیوت پرسیارم نییە، وتنەکەی بە جۆرێك بوو، وەك ئەوەی بڵێت پرسیارم هەیە بەڵام نایپرسم... من کەمێك زیاتر پێداگریم کرد، ئیدی چاوەکانی گەشانەوە و کەوتنە ترووکان. مەراقی منیش زیادی کرد، تۆ بڵێی ئەو سڵەمینەوەیە چی بێت لەناو ئەم دەروونە بچکۆلانەیەدا. بەڵام ناچار بووم جێی بهێڵم، چونکە زەنگی دەست پێکردنی وانە لێیدا.

***

دوای کۆتا وانە، چاوەڕێی جەلال بووم. جانتاکەی بە شانەوە بوو و خەریك بوو لە قوتابخانە دەردەچوو، هەستم کرد هێشتا لەناو بیرە ئۆقرە لێهەڵگیراوەکانی پێشوویدا بوو. دەتوت ناوێرێت لێم نزیك ببێتەوە. بەترسەوە، ئاوا کەوتە گۆ:

– مامۆستا ! دەزانم هەر سوور دەبیت، بۆیە پرسیارەکەم دەکەم. بەڵام تو خودا، با هەر لە بەینی خۆماندا بێت. لە تۆ زیاتر کەس نەیبیستیٚ و نەیزانیٚ... ئەم پرسیارە زۆر لە مێژە بووە بە ماخۆڵانی مێشکم. بەڵام نەموێراوە لە کەسی بپرسم. جارێکیان لەماڵەوە لەگەڵ باوکم ئەم مەسەلەیەم کردەوە. پێی وتم: "نەکەیت جارێکی تر پرسیاری وا بە مێشکتدا بهێنیت، دوایی دەبیت بە گاور". ئیتر لەو ڕۆژەوە، لە مێشکم دەرنەچووە. چەند دەکەم هەر لە بیرمە. کە تۆ نامەی گەنجە فەلە بووەکەت خوێندەوە، ئەوەندەی تر ترس دایگرتم. ناوکم کەوت، نەکا منیش بەهۆی ئەم گومانانەوە لە دین دەربچم.

کاتێك کە وتت دەتوانن هەموو شتێك بپرسن، بڕیارم دا لێتی بپرسم. بەڵام دواتر بیرم کردەوە کە ئەمە وەك هەر پرسیارێکی دی نییە، جیایە... سامدارە... باشە بۆچی بە مێشکی کەسدا نایات، تەنها هی من نەبێت؟ نەکا نیشانەی باوەڕ لاوازیی من بێت؟ ئەگەر نا...

لێرەدا هەڵوەستەیەکی کرد و چاوە تەڕ بووەکانی داگرت. دەگریا... گریانەکەی بە هەنسکیشەوە بوو. بە جۆرێك دەگریا،

ئەوەی بەوێدا تێپەڕیبایە، هەستی پێدەکرد. دیسان ویستی بڕوات، بەڵام من ڕێم نەدا:

– تا نەزانم پرسیارەکەت چییە ناهێڵم بڕۆیت. هەر دەبێ تۆ بپرسیت و منیش وەڵامت بدەمەوە. خۆ ئەگەر وەڵامەکەشم لا نەبوو، هەوڵ دەدەم بە دەستی بخەم، ئینجا بۆتی باس بکەم.

وەلێ ئەوەش بزانە، پرسیارەکەت هەر چییەك بێت، بە هیچ جۆرێك ئەوە دەرناخات کە باوەڕت نییە یان لاوازە. چونکە ئەوەتا تۆ لەبەر ئەو شتەی لە مێشکتدایە دەگری. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە تۆ هاوڕای ئەو پرسیارە نیت کە مێشکی تێکداویت و، باوەڕت پێی نییە. بەڵکو گەرەکتە فێرببیت. دەتەوێت فێرببیت، تێبگەیت و باوەڕ بێنیت.

ئەگەر باوەڕت بەو پرسیارە هەبووایە کە لە مێشکتدایە و ناڕەحەت نەبوویتایە پێی، ئاوا دڵتەنگ نەدەبوویت و نەدەگریایت. ئەم دڵ ئێشە و ئەسرینانەت، جارێکی تر ئەوە دەردەخەن کە تۆ خاوەن باوەڕێکی بەهێزیت.

جەلال، کەمێك دڵنەوا ببوو. جانتاکەی دانایە سەر ئەرز. بە دەستەسڕەکەی، فرمێسکەکانی سڕی و وتی:

– دە مادام، مامۆستا! پرسیارەکەم دەکەم. بەو هیوایەی دوای پرسیارەکەش، هەر وا لێم بڕوانیت.

- بێگومان ئەو کاتیش هەر وا بەباشی لێت دەڕوانم دڵنیا بە لەمە. ئەمە وێڕای ئەوەی کە ناچارم هەر وا لێت بڕوانم، چونکە ئەم حاڵەی تۆ، جوانترین سەلمێنەری چاکی و باوەڕدارییتە.

جەلال هەمدیس کەمێك ڕووی وەرگێڕا، هەناسە و بوێریی کۆکردەوە. دوا جار پرسیارەکەی کرد:

- مامۆستا ! من زۆر چێژم لە وانە بەراییەکانی جەنابتان وەرگرت. چونکە لەو وانانەدا بوونی خودات سەلماند. یەکێکیش لە ڕێگاکانی ئەو سەلماندنانە ئەوە بوو کە هەموو شتێك لەم جیهانەدا بکەرێکی هەیە. من ئەمەم زۆر بە دڵ بوو هەروەها بە نموونەی جۆراوجۆرەوە بۆ هاوڕێکانم باس دەکرد. "لە کاتێکدا کە نیگارێکی سادەش نیگارکێشێکی هەبێت، ئایا نابێت ئەم گەردوونەش بەدیهێنەرێکی هەبێت؟" ئەم جۆرە پرسیارانەم لە هاوڕێکانم دەکرد. گەنجێکی دراوسێمان کە قوتابیی دواناوەندی بوو، پێی وتم:

● یەکێك دەچێتە لای (ویلیام پالێی) و دەڵێت: "خودا بوونی نییە". داوای لێدەکات، ئەگەر وا نییە، بۆی بسەلمێنێت. (پالێی)یش یەکسەر کاتژمێرەکەی باخەڵی دەردەهێنێت، قەپاغەکەی لادەدات و ناوەکەی پێ نیشان دەدات و دەڵێت: "ئەگەر من بانگەشەی ئەوە بکەم کە هەموو ئەم چەرخە و سپرینگ و فورمیشانە هەر لە خۆوە دروست بوونە، پێکەوە کەوتوونەتە دانوستان و هەر لە خۆشیانەوە هاتوونەتە ناوەوە و بە گەڕ کەوتوون، گومان لە ئەقڵم ناکەیت؟ بەدڵنیاییەوە دەیکەیت. دە سەیرێکی ئەو ئەستێرانە بکە. هەر یەکەی خولگە و جووڵەیەکی تایبەت بە خۆی هەیە. گۆی زەوی و هەسارەکانی تر بە ڕێکخستنێکی بێکۆتاوە لە دەوری خۆر خول دەخۆن. ئەمە جگە لەوەی ئەم کۆمەڵانە، ڕۆژانە ملیۆنێك میل ڕێ تەی دەکەن. هەر ئەستێرەیەك هاوشێوەی خۆر، کۆمەڵەیەکی سەربەخۆی هەیە و وەك کۆمەڵەی خۆرەکەی ئێمە لە بۆشایی ئاسماندا لە جووڵەدایە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، بەریەك کەوتن و لێتێکچوون و بە زەرڕە ئاڵۆزییان نییە. هەموویان بەهێمنی و ڕێکوپێکی لە کاردان. باشە باوەڕکردن بەوەی کە هەموو ئەمانە لە خۆوە دێنە بوون ئاسانترە یان ئەوەی لە لایەن خالقێکەوە بێنە بوون؟"

دیل کارنگی

– باشە ئەگەر هەموو شتێك بەدیهێنەرێکی هەبێت و ئەو بەدیهێنەرەش خودا بێت، ئەی نابێت ئەویش بەدیهێنەرێکی هەبێت؟

بەم پرسیارە سەرم سوڕما و چەند ڕۆژێك کەوتمە بیرکردنەوە و ڕامان. چەندم بیر لێدەکردەوە نەمدەتوانی لێی دەربچم. وەك

پێشتریش وتم، ماوەیەك باسەكەم لەماڵەوە كردەوە. ئەوەبوو باوكم پێی وتم بیر لە شتی وا بكەیتەوە دەبیت بە گاور و لە دین دەردەچیت، بەڵام من نەمتوانی بیری لێنەكەمەوە، دەبیٚ حاڵی من چی لێبێت؟... من...

كە قسەكانی بەمە گەیشتن، بەهۆی نركەوە قورگی گیرا. چاوەكانی ئاویان تێزا. پێم وت:

– ڕەنگە كەسانێكی تریش لە پۆلدا هەبن، ئەم پرسیارەیان لا بووبێت بە مەراق. بۆیە من ئەم بابەتە لە وانەی داهاتوودا ڕوون دەكەمەوە، تاكو هاوڕێكانیشت وەڵامەكەیان دەست بكەوێت.

جەلال سوپاسگوزاریی دەربڕی و ڕۆیشت. من لەم میانەیەدا هەستم بە خۆشیی چارەسەركردنی ڕازێكی ئەو قوتابییەم نەدەكرد، چونكە لە كاتی قوتابێتیی مندا، نەك لە ناوەندی، بەڵكو لە دواناوەندیشدا پرسیاری وا بە مێشكمدا نەدەهات. ئێستا ئەو مێشكە بچووكانە بیر لە چی دەكەنەوە و لەناو چ جۆرە پرسیار و گومانێكدا گیریان خواردووە؟! خزمەت كردن بە باوەڕیان، چ بەرپرسیارێتی و ئەركێكی مەزنە...

# موعجیزەیەکی پێغەمبەرﷺ

دوای چەند ڕۆژێك، باسەکەم لە پۆلدا کردەوە. سەرم سوڕما کە بۆم دەرکەوت زیرەکترین قوتابییەکانی پۆل بیریان لەم مەسەلەیە کردووەتەوە و لێیان بووە بە مەراق... بەڵام ئەوانیش هەر لەبەر ئەو هۆیانەی کە جەلال بیری لێکردبوونەوە، نەیانوێرابوو بیپرسن. بەهۆی ئەوەی پرسیاری وایان بە مێشکدا هاتبوو، شەرم دایگرتبوون و بە سەرسوڕمانەوە چاوەڕوان بوون بزانن من دەڵێم چی.

وتم:

- ڕۆڵەکانم! ئەوە بۆ من شتێکی چاوەڕوان نەکراو نییە کە شتێکی واتان بە مێشکدا هاتبێت یان یەکێك خستبێتییە مێشکتانەوە. من چاوەڕوان بووم بزانم داخۆ دەبێ کەی ئەم پرسیارەم ئاراستە بکەن...



وایان دەزانی گاڵتەیان لەگەڵدا دەکەم و بە پرسیارەکەیان تێکچوومە، بەڵام بە ڕوون کردنەوەکانم خەیاڵیان تەخت بوو و بەورياییەوە کەوتنە گوێ ڕادێران:

– چاوەڕێی ئەم پرسیارەم لێدەکردن، چونکە پێغەمبەرمان (درودی خودای لێبێت) وەك پەرجوو (موعجیزە)یەك ئەوەی ڕاگەیاندووە کە ڕۆژێك دادێت مرۆڤەکان ئەم پرسیارە دەکەن. کەواتە بە کردنی ئەم پرسیارە یەکێکی تر لە پەرجووەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) دەردەکەوێت، کە بەر لە ١٤ سەدە خەبەری لەبارەوە داون.

## با بەدیهێنەر بە بەدیهێنراوان بەراورد نەکەین

– با بێینە سەر وەڵامی پرسیارەکەتان... "هەموو شتێك دروستکەرێکی هەیە. نیگار نیگارکێش و پەیکەر پەیکەرتاش و مێزیش دارتاش دروستی دەکات. ئەم گەردوونەش خودا دروستی کردووە. ئەی خودا، کێ دروستی کردووە؟ ئایا پێویست ناکات ئەویش دروستکەرێکی هەبێت؟"، وا دەڵێن، وا نییە؟

بێگومان پێویست ناکات، چونکە هەموو ئەوانەی کە دەڵێین دروستکەر و بەدیهێنراویان هەیە، «بەدیهێنراو»ن... هەر لە نیگار و پەیکەر و مێز و ڕەحلە و .... هەر هەموویان بەرهەمگەلی دروست کراون. هەموو بەرهەم و دروستکراوێکیش، دروستکەر و بەدیهێنەری هەیە. کاتێك دێین و دەپرسین: "ئەرێ خوداش بەدیهێنەرێکی هەیە؟" ئەوا کارێکی هەڵەمان کردووە.

ئەمە هەڵەیەکی مەنتیقی و هزرییە، چونکە ناکرێ بڵێین مرۆڤ و دار و ئاژەڵ بەدیهێنەری هەیە، ئەی بۆچی خودا نییەتی. ئەگەر وامان وت، مانای وایە بەدیهێنەر و بەدیهێنراومان تێکەڵ کردووە. ئەمەش وەك وتم هەڵەیەکە لە مەنتیق و هزردا.

سیفەتی بەدیهێنراوان شتێکە و هی بەدیهێنەر شتێکی تر. پێویستە ئەم دووانە لێك جیا بکەینەوە. بۆ ئەوەی بتوانین ئەم جیاکارییە بکەین، سەرەتا دەبێ سیفەت و تایبەتمەندییەکانی ئەو بەدیهێنەرە باش بزانین کە باوەڕمان بە بوون و تەنهاییی هەیە. بۆ نموونە: یەکێك لەو سیفەتانە، (تکوین) واتە بەدیهێنانە، خودا بەدیهێنەرە. ئەمە لە کاتێکدا کە بەدیهێنراوەکانی، بەدیهێنەر نین... واتە ناتوانن شتێك لە نەبوونەوە بهێننە بوون...

کەواتە ئەگەر بێژین: "ئایا خوداش بەدیهێنەرێکی هەیە؟"، ئەوا ئەومان بە بەدیهێنراو داناوە، بەم جۆرەش دوو شتی جیاوازمان بە یەك چوواندووە و شتێك کە لە یەکێکیاندا هەیە، لەوی تردا بەدوایدا گەڕاوین. مەگەر ئەمەش گەورەترینی هەڵەکان نییە؟

بۆ نموونە: سەیرێکی ئەو (ڕەحلانە) بکەن کە لەسەری دانیشتوون، کێ دروستی کردوون؟

– دارتاش دروستی کردوون...

– باشە کەس لە ئێوە ئەو دارتاشەی بینیوە؟...

– نەخێر، نەمانبینیوە و نایناسین...

- دە با من پێناسێکیتان بۆ بکەم... ئەو دارتاشەی بە دروست کردنی ئەم ڕەحلانە هەڵساوە، هەر وەك ئەو ڕەحلانەی دروستی کردوون، بوونەوەرێکی یەك مەترییە، سەرێکی تەخت و ئەستووری هەیە لەگەڵ چوار پەلی ئاسن.

ئایا باوەڕ دەکەن دارتاشەکە وەها بوونەوەرێك بێت؟ بەو پێکەنینەتان دەتانەوێ بڵێن چۆن شتی وا دەبێت، وا نییە؟

- بەڵێ، بزانم جەلال! بۆ ناشێت دارتاشەکە ئاواهی بێت؟

- مامۆستا! تۆ کە باسی دارتاشەکە دەکەیت، بە لێکچوواندنی بەو ڕەحلانەی دروستی کردوون، باسی دەکەیت. ئەمە لەکاتێکدا کە ئەو ڕەحلانەی دروستی کردوون شتێکە و خۆی شتێکی تر... واتە ناکرێت وەستایەك بەو بەرهەمە بچوێنرێت کە دروستی کردووە.

- ئەگەر پێکیان بچوێنین چی دەبێت؟

- وەك خۆت کەمێك لەمەوبەر وتت، ئەوا هەڵەیەکی مەنتیقیمان کردووە، چونکە ئەوکاتە وەستا و دروستکەرێك لەگەڵ ئەو بەرهەمانەی دروستی کردوون کە هەریەکەیان خەسڵەتی تایبەت بەخۆیان هەیە، بە یەکمان چواندوون...

- ئافەرین، جەلال! بێگومان ڕەحلە شتێکە و وەستای دروستکەری شتێکی تر. ئەو نیگارەی لە سەر کاغەز یان پەڕۆ کێشراوە شتێکە و ئەو نیگارکێشەی دروستی کردووە شتێکی تر. گەر ئەمانە بە یەك بچوێنین ئەنجامی هەڵەمان دەست دەکەوێت.

– باشە بۆچی ناتوانرێت نیگارێك بە نیگارکێشەکەی بچوێنرێت؟ عائیشە! تۆ پێمان بڵێ.

– مامۆستا! نیگار هێڵکارییەکە لەسەر ڕووپەڕێکی تەختدا. تەنها دیمەنێکە و گیانی لەبەردا نییە. ئەمە لە کاتێکدا کە ئەو نیگارکێشەی



● نیگار شتێکە و نیگارکێش شتێکی تر. نیگار هێڵکارییەکە لەسەر ڕووپەڕێکی تەختدا، دیمەنێکی بێگیانە، بەڵام نیگارکێش مەردمێکی زیندووە.

کێشاویەتی، گیاندارە. هەم لە ڕووە دەرەکییە چەند لایەنییەکەیەوە، هەمیش بە ئەندامە زۆر سەیر بەدیهێنراوەکانی ناوییەوە شتێکی تەواو جودایە لە نیگار. لەم گۆشەنیگایەوە هیچ یەکێك لەم پۆلەی ئێمە حەز ناکات بەو نیگارە بشوبهێنرێت کە کێشاویەتی.

– ئافەرین بۆ تۆش، عائیشە! نموونەکەت زۆر جوان شی کردەوە...

کە بەم جۆرە ئافەرین بۆ کردنەکان بە دوای یەکدا هـاتن، (بـوراق) کە یەك لە قوتابییە بزێوە خۆش تەبیعەتەکانی پۆل بوو، هەڵیدایێ:

- مامۆستا! منیش نموونەیەك لەسەر ئەم بابەتە بێنمەوە؟

- ئەی بۆ نا؟! بیڵێ بزانم.

- هاوڕێیان! سەیرێکی ئەو گڵۆپە بکەن...

کـە دەسـتی بـۆ یـەکێك لـە گڵۆپـەکانی پۆلەکـە درێـژکرد، گشـت قوتابییەکان بە خەندە و سەرسـوڕمانەوە ڕوویـان کـردە بنمیچـەکە. بوراق قوتابییەکی گەلێك ژیر بوو و هەموو شتێکی جـددیی تێکـەڵ بـە گاڵتە دەکرد، ئینجا دەیگێڕایەوە.

- دەی، هەمووان گڵۆپەکەیان بینی، ئینجا...



– مامۆستا! ئەدیسۆن گلۆپی دۆزیوەتەوە و بۆ یەکەم جار دروستی کردووە، بەڵام ئێمە ئەو ئەدیسۆنەمان نەبینیوە. ئایا کە وترا ئەدیسۆن، دەبێ بڵێین شتێکی ئاوا خڕ و شووشەییە؟

بوراق دەیویست زیاتر ئاو بە بابەتەکەدا بکات، من کەوتمە گۆ:

– هەڵبەتە ئەدیسۆن جیایە و ئەو گلۆپەی دروستیشی کردووە جیا... هیچ هاوبەشییەك نییە لەنێوان تایبەتمەندییەکانی ئەم دوانەدا، هەر بۆیە ناتوانین ئەدیسۆن بەو گلۆپە بچوێنین کە دروستی کردووە.

دوای ئەم نموونانە، لە پۆلم پرسی:

– ئەو ئەنجامە گشتییە کامەیە، کە لەم نموونانەوە دەستمان دەکەوێت؟

| ● دەمێ ساڵە لە هەوڵی دۆزینەوەی شتانێکدام. ئەو ئەزموونەی لەم هەولانەوە بەدەستم هێناوە ئەوەیە کە خودا بۆ هەموو ئەو کێشانەی دایناون چارەسەرێکیشی داناوە. ئەگەر من و تۆ بەو چارەسەرەمان نەزانی، با بەوپەڕی خاکەڕاییەوە ددان بەوەدا بنێین کە کلۆڵین. با هیچ کاتێك ئەو قەباحەتە نەخەینە پاڵ خودا و، باوەڕیشمان وا بێت ئەو شتی مەحاڵی دروست نەکردووە.<br>ئەدیسۆن |
|---|

نزیکەی تێکڕای پۆل دەستی هەڵبڕیبوو:

– عەلی! بڵێ بزانم.

– مامۆستا! وەستا و دروستکەر بەو شتە ناچوێنرێن کە دروستیان کردووە. بۆیە بەدیهێنراو شتێکە و بەدیهێنەر شتێک. ناکرێت بە یەک چاو سەیری هەردووکیان بکرێت.

– دەی ئینجا با بێینە سەر ئەنجامەکە:

ئەگەر نەتوانرێت هیچ بەرهەمێك بە دروستکەرەکەی بچوێنرێت، بەدیهێنراو وەك بەدیهێنەر نەبێت، ئایا دەتوانین خودا بە مرۆڤەکان بچوێنین؟

– نەخێر، ناتوانین.

– کەواتە ئایا دەتوانین بێژین بەو پێیەی هەموو بەدیهێنراوێك بەدیهێنەرێکی هەیە، ئایا خوداش بەدیهێنەری هەیە؟

– نەخێر، ناتوانین.

***

## ئایا دەکرێت شتێك

## هەم بەدیهێنەر و هەم بەدیهێنراویش بێت؟

– کەواتە پرسیاری "کێ خودای بەدیهێناوە؟"، پرسیارێکی نامەنتیقی و هەڵەیە. پرسیارێکە، نەفامیی بکەرەکەی دەردەخات. ڕەنگە بتوانرێت لەو کەسانە بپرسرێت، کە باوەڕیان بە بەدیهێنەری بێبنەما هەیە... بەڵام پرسینی لە موسوڵمانێك، زۆر هەڵەیە و ناپێکێت، چونکە ئەو بەدیهێنەرەی موسوڵمان باوەڕی پێیەتی،

ئەزەلی– واتە بێسەرەتایە– ، ئەبەدی – واتە بێکۆتایە– ، نیازی بە هیچ شتێك نییە، بێهاوتایە، بێهاوشێوەیە، بێهاوشانە، تاقانەیە... تاکە خودایە کە لەدایك نەبووە، لە کەس نەبووە. خودایەك کە خاوەنی ئەم هەموو سیفەتانە بێت، چۆن دەکرێت بە زیندەوەرانێك – کە خاوەنی هیچ یەکێك لەم سیفەتانە نەبن– یان بە مرۆڤ بچوێنرێت؟

دەزانن ئەم پرسیارە لە چی دەچێت؟

لەوە دەچێت یەکێك باسی مرۆڤتان بۆ بکات. باس و پێناسی قژ و برۆ و چاو و ئەقڵ و فکریتان بۆ بکات. ئێوەش بێژن: "ئەی باڵەکانی چۆنن؟". کاتێکیش کە بوترێ پرسیاری وا چۆن دەبێ، ئامارە بە جۆرەکانی باڵندە بدەن و بڵێن: "دە بڕوانە، ئەم زیندەوەرانە هەر هەموویان باڵیان هەس."

وەڵامێکی وا چەند کۆمیدییە، وا نییە؟ چونکە بە یەك حسێب کردنی دوو بوونەوەری جودای وەك مرۆڤ و باڵندە چەند ناماقووڵ و کۆمیدی بێت، چواندنی خوداش بە بەدیهێنراوان و پرسینی ئەو جۆرە پرسیارانەش هەر هیچ نەبێت ئەوەندە کۆمیدییە.

خۆ ئەگەر بەوردی لێکی بدەینەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە کۆمیدیایی و نەسازیی پرسیارەکە لە دوو توێی خۆیدایە، چونکە ئەو کەسەی دەڵێت: "خودا هەموو شتێکی بەدیهێناوە، ئەی کێ ئەوی بەدیهێناوە؟"، سەرەتا بەدیهێنەریی خودا پەسەند دەکات و دواتریش سۆراغی ئەوە دەکات کە کێ ئەوی بەدیهێناوە. لەمەدا چی

ڕوودەدات؟ دژ یەکییەك دێتە ئاراوە، چونکە سەرەتا خودا وەك بەدیهێنەرێك قەبووڵ دەکرێت و دواتریش لە بەدیهێنراویی دەکۆڵرێتەوە. ئایا دەکرێت شتێك هەم بەدیهێنەر و هەم بەدیهێنراویش بێت؟ دەکرێت شتێك لە هەمان کاتدا دوو شت بێت؟ خودا بەدیهێنەرە، بۆیە نابێت بە بەدیهێنراو. هەر بۆیە ناماقووڵییە لەوە بکۆڵرێتەوە کە کێ بە بەدیهێنانی هەڵساوە.

چونکە بەدیهێنەر، بەدیهێنراو نییە. ئەگەر بەدیهێنراو بوایە، ئایا دەیتوانی ببێت بە خاوەنی هێزی بەدیهێنان؟ مادام خاوەنی هێزی بەدیهێنانە، کەواتە بەدیهێنراو نییە. تەنانەت مرۆڤیش کە باڵاترین و بەتواناترینی بەدیهێنراوانە، ناتوانێت هیچ شتێك لە نەبوونەوە بێنێتە بوون. ئەی ئەو خودایەی کە هەموو شتێك لە نەبوونەوە بەدیدێنێت، چۆن دەکرێت بکرێت بە بەدیهێنراو؟

## وەستا پەیوەست نییە بە بەرهەمەکەیەوە

– چەوتییەکی دیکەی ئەم بۆچوونە، ئاوا دەردەکەوێت:

ئەو کەسەی شتێك دروست دەکات، ئەو وەستایەی بەرهەمێك بەرهەم دێنێت، لەسەری نییە پەیوەست ببێت بە بەرهەمەکەی و ئەو یاسایانەی بۆی داناوە. کەواتە وەك چۆن پێویست ناکات ئەو ڕێسایەی کە بەرهەمە دروستکراوەکە وابەستە پێیەوە و پابەندیی لێدەکات، بەهرەمەندەکەش پابەندی بێت، ئاواش پێویست ناکات



بەدیهێنـەر پابەنـدی ئـەو ڕێسـایانە بێت کە بەدیهێنراوەکانی پێ پابەنـد کـردوون، چـونکە ئـەوەی کـە داهێنـراوە و ئـەو ڕێسـایانەش کـە پێیانـەوە پابەنـدە، جێدەسـتی داهێنەرەکەن. ئایا مرۆڤ لەسەریەتی پابەند بێـت بـە بەرهەمەکانییـەوە و ئـەو ڕێسـایانەی پێـوەی پەیوەسـت کردوون؟

بۆ نموونە: ئەوەی ئۆتۆمبێلی دروست کردووە و لەناو چەند یاسا و ڕێسایەکدا ڕۆیشتنیی دەستەبەر کردووە مرۆڤـە. ناکرێـت بـیر لـەوە بکرێتەوە ئەو ئۆتۆمبیلە لەو ڕێسایانە بێتە دەر و بـە هەوەسـی خـۆی بجووڵێت. ناتوانین مرۆڤ لە هیچ ڕوویەکەوە بە ئۆتۆمبێلی جێدەسـتی بچوێنین. گەر بەیەکیان بچوێنین، ڕێـك دەبێـت بـە گاڵتـەجاڕیی. ئایا مرۆڤـ کـە بـە ویسـتی خـۆی دەجووڵێـت، بـیر دەکاتـەوە، دەخـوات، دەخواتەوە، دەگەڕێت، دەخەوێت و هەڵدەسێت و ئـارەزووی هەنـدێك شت دەکات، هـیچ لـەو بەرهەمـەی دروسـتی دەکات، بـۆ نموونـە لـە ئۆتۆمبێـل، دەچـێت؟... ئـەو دووانـە، بـە لەبەرچـاوگرتنی ئـەو تایبەتمەندییانـەی هـەڵیانگرتوون چـەندە جیـاوازن! کەواتـە هـیچ پێکچوونێك لەنێوان وەستا و بەرهەمەکەیدا نییە...

ڕێـك هـەر وەك ئـەوەی نـاو ئـەم نموونەیـە، ئـەم گەردوونـەش بوونەوەرێکی بەدیهێنراوە. ئەوەشـی کـە لـە نەبوونـەوە هێناویەتییـە بوون، خودایـە. گـەردوون تایبەتمەندیگـەلێکی هەیـە، کـە خـودا بۆی داناوە. سیفەتەکانی خودای بەدیهێنەری، تەواو و پڕ جیاوازن لـە هـی گـەردوون... تەنانـەت بەراوردکردنیشـیان، پـڕ جیاییـەکی وایـە کـە مومکین نییە.

● وەك چـۆن بووکەڵـەی قورمیشـدار ناتوانێـت ئـەو بەهرەمەندەی دروستی کردووە، هەروەها سیفەتەکانیشی بەخۆی بچـوێنێت و بپێوێـت، ئـاواش مـرۆڤ ناتوانێـت خـودا کـە بەدیهێنەریـەتی، بـەخۆی بچوێنێت. هەر بۆیەش ناتوانێت لە بەدیهێنەردا بەدوای سیفەتە بەدیهێنراوییەکـەی خۆیـدا بگەڕێت.



بـۆ ئـەوەی باشـتر لەمـە تێبگـەن، سـەیرێکی ئـەم نموونەیـەش بکەن... بیر لە بووکەڵەیەکی قورمیشدار بکەنەوە. وەهـا بووکەڵەیـەك کە بـە قـورمیش دەجوولێت و هەنـدێك توانـای هەیـە، ئەگـەر توانـای

بیرکردنەوەی هەبوایە و بهاتایە هەموو شتێکی بەخۆی بچواندایە و هەڵبسەنگاندایە، ئایا ئەمە ڕاست دەبوو؟ واتە ئەگەر بێت و گیانەوەرەکانی دەوروبەری و ئەو مرۆڤەیش کە ئەوی دروست کردووە، بەخۆی بچوێنێت و بڵێت ئەویش وەك من بە قورمیش کار دەکات، نابێت بە گاڵتەجاڕیی؟

هەر وەك چۆن بووکەڵەیەکی قورمیشدار ناتوانێت ئەو بەهرەمەندەی دروستی کردووەو، سیفەتەکانیشی بەخۆی بچوێنێت و بپێویَ، ئاواش مرۆڤ ناتوانێت خودا کە بەدیهێنەریەتی، بەخۆی بچوێنێت. هەر بۆیەش ناتوانێت لە بەدیهێنەردا بە دوای سیفەتە بەدیهێنراوییەکەی خۆیدا بگەڕێت. خۆ ئەگەر وا بکات، مانای وایە خۆی داوەتە بیرکردنەوەیەکی فرە قۆشمەوە.

| |
|---|
| ● هەر ڕێسایەك کە گوزارشت لە یاسایەکی سروشتی دەکات، موناجاتێکە و پەسنی خودا دەدات.<br>ماریا میشێل |

چونکە بیرکردنەوەی وا، لە جیا نەکردنەوەی بەدیهێنەر و بەدیهێنراوەوە سەرچاوە دەگرێت و چاوەڕوانی کردنی ئەوەیە کە خودا خۆیشی پابەند و شوێنکەوتەی ئەو ڕێسایانە بێت کە بۆ بەدیهێنراوەکانی دایناون. ئەمە لە کاتێکدایە کە ناکرێت بیر لەوە بکرێتەوە بەدیهێنەر ملکەچی ئەو ڕێسایانە بێت کە بۆ بەدیهێنراوەکانی دایناون. ئایا ئەوەی بووکەڵەی قورمیشدار دروست

دەکات، خۆیشی دەبەستێتەوە بە قورمیشەوە؟ ڕێك وەك ئەمە، خوداش هۆیەکانی بۆ ئێمە -واتە بەدیهێنراوەکان- داناوە. ئێمە و ئەو گەردوونەی تێیدا دەژین بە هۆکاری جۆراوجۆرەوە بەستراوینەتەوە. هەر هۆکارێك وەك یاسایەك وایە کە بوونەوەرەکان ناتوانن لێی دەربچن. چونکە ئەوانەی خودا ئافراندوونی، لەنێو زەمان و مەکاندا دەژین. هەر بۆیە لەسەریانە پابەند ببن بەو یاسایانەی لەوێدا هەن، کە ئێمە پێیان دەڵێین هۆکارەکان. لەبەر ئەوەی ناتوانن لە زەمان و مەکان بێنە دەر، ناتوانن لەو یاسایانەش بێنە دەر، کە پێیانەوە پەیوەستن. بەڵام خودا کە بەدیهێنەری زەمان و مەکانە، لە سەرووی ئەو هۆکار و یاسایانەوەیە، چونکە ئەو بەدیهێنەری زەمان و مەکان و بوونەوەرەکان و ئەو یاسایانەشە کە بۆیان دانراون.

ئێستا دوای بیرکردنەوە لەمانە و تێگەیشتن لێیان، ئایا پرسیاری: "هەموو شتێك لەلایەن خوداوە بەدیهێنراوە، ئەی کێ خودای بەدیهێناوە؟" بێ وەڵام دەمێنێتەوە؟ ئەم زانیارییانە ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە دەتوانرێت پرسیارێکی وا، لەژێر تیشکی ڕێسا مەنتیقی و ئەقڵییەکاندا بەئاسانی وەڵام بدرێتەوە.

# ئەگەر بەدیهێنەر، بەدیهێنەری هەبوایە...

بۆچی پرسیاری: "کێ خودای بەدیهێناوە؟" هەڵەیە؟ یەکێك لە گرنگترین هەڵەکانی ئەم پرسیارە، نەوەستانی لە خاڵێك و زریزە ئاسا درێژ بوونەوەیەتی. ئەگەر ئەو کەسەی ئەم پرسیارە دەکات، وا وەڵام بدرێتەوە کە یەکێکی تر بەدیهێناوە، ئەوە ئەو پرسیارە دەبێتە شتێك کە تەواو بوون و بڕانەوەی بۆ نەبێت. چونکە ئەگەر بەدیهێنەر، بەدیهێنەری هەبێت، ئەویش بەدیهێنەری دەبێت. واتە ئەوەی بەدیهێنەریشی بەدیهێناوە، بەدیهێنەری دەبێت و... بەم جۆرە زنجیرەیەکی بەدیهێنران دێتە گۆڕێ کە لە چوارچێوەی ئەقڵ و خەیاڵدا جێی نەبێتەوە، ئەمەش ئەنجامێکی تا بڵێی ناماقووڵە. ئەو کەسەی نەتوانێت یەك بەدیهێنەر لە مێشکیدا جێ بکاتەوە، ناچار دەبێت بەدیهێنەرانێکی بێشومار قەبووڵ بکات...

کە قسە بەمە گەیشت، لە جەلالم دەڕوانی. لە خۆشیی تێگەیشتن لە بابەتەکە، چاوەکانی دەبریسکانەوە. لێم پرسی:

– جەلال! بڵێ بزانم، ئایا ئەوە ڕاستە یەك بەدیهێنەرت قەبووڵ نەبێت، بەڵام بەو هۆیەوە ناچار ببیت ئەو هەموو بەدیهێنەرە بێشومارە قەبووڵ بکەیت؟

لە هەموو شتێکدا یەکێتییەك هەیە.
یەکێتییش هێما بۆ یەکێك دەکات.

جەلال ئەم وەڵامە جوانەی دایەوە، کە پێشبینییەکەمی ڕاست دەرچواند:

– بێگومان ڕاست نییە، مامۆستا! چونکە ئەگەر وابێت، ئەوا پرەنسیپی تاقانەیی خودا پێشێل کراوە. ئەمە لە کاتێکدا کە تاقانەیی ئەو، گشت زانستەکان بە هەزاران بەڵگەوە دەیسەلمێنن. شێوازەی نەشێواوی گەردوون، پێکهاتە و جووڵەی زەوی، وەرزەکان، ڕێکیی شەو و ڕۆژگار، هەر هەموویان هێما بۆ پەروەردگاری تاق و تەنیا دەکەن.

– ئافەرین، جەلال! قسەکەت زۆر جوانە. خۆ لە قورئانی پیرۆزیشدا، خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلاَّ اللَّهُ لَفَسَدَتَا﴾ الأنبياء: ٢٢، واتە « ئەگەر خودای ڕاستەقینە لە زاتی خودا بەولاوە لە ئاسمانەکان و لە ئەرزدا ببوایە، ئاسمان و ئەرز تێك ئەچوون.»

• ﴿مَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَهٍ إِذًا لَذَهَبَ كُلُّ إِلَـهٍ بِمَا خَلَـقَ وَلَعَلاَ بَعْضُـهُمْ عَلَـى بَعْضٍ﴾ المؤمنون:٩١، واته « هیچ خوایەکی لە خۆی بەولاوە لەگەڵ نەبووە و نییە. ئەگەر خوایەکی دیکەی لەگەڵ بوایەو هاوبەشی هەبوایە، هەر خوایەك لە خوایەکان بەشە دروستکراوی خۆی ئەبرد بۆ خۆی ئەبوو بە شەڕیان و ئەچوون بەگژی یەکداو هەندێکیان زاڵ ئەبوون بەسەر هەندێکیانا..»

• ﴿أَءِلَهٌ مَعَ اللَّهِ﴾ النمل:٦٢، واته « ئایا خوایەکی تر هەیە لەگەڵ خوادا هاوبەشی بێ لە کردنی ئەم کارانەدا؟ نەخێر نییە » .

قورئانی پیرۆز

هەر بەڕاستیش، ئەگەر بەدیهێنەر دووان یان زیاتر بوایە، ئەو شیرازە سەرسوڕهێنەر و پلانە تۆکمەیەی لە زەوی، ئاسمان، دەریا، مرۆڤ و گشت بوونەوەرەکاندا هەیە، تێکدەچوون. بوونی شیرازەیەکی وا و بەردەوامبوونی بە بێ تێکچوون، باشترین سەلمێنەری یەکیەتیی بەدیهێنەرە. ئەگەر نا، ئەوەی بەدوای پرسیاری: "کێ خودای بەدیهێناوە؟"دا دەگەڕێت، دەتوانێت وەڵامەکە زریزە ئاسا درێژ بکاتەوە، بەم دانانان بە خوداگەلی لە ژمارە نەهاتووەیش، ئەوا وەك ئەوەی تۆ وتت، پرەنسیپی یەك خودایی پێشێل کردووە. ئەمە لە کاتێکدا، یەکیەتیی خودا، ڕاستییەکی هێندە بنبڕە کە گشت زانستەکان بە هەزاران بەڵگەوە پشتڕاستی دەکەنەوە.

***

کەواتە درێژبوونەوە و بەردەوامییەکی زریزەیی لەم پرسیارەدا هەیە. ئەم پرسیارە لە کوێدا دەوەستێت؟ بەدیهێنەریش بەدیهێنەری هەیە، ئەویش هەیەتی، ئەویش هەیەتی، ئەویش... ئایا هەر بەم جۆرە بەردەوام دەبێت و تا بێکۆتا و بێبڕانەوە درێژدەبێتەوە، یان لە شوێنێکدا دەبڕێتەوە و بەکۆتا دێت؟ هەڵبەتە پێویستییەکی ئەقڵ و مەنتیق ئەوەیە لە شوێنێکدا ببڕێتەوە و دواییی بێت. جا ئەو دوا بەدیهێنەرەی کە پرسیارەکە پێی بەکۆتا دێت، بەدیهێنەری ڕاستەقینەیە. واتە کاتێک دەڵێین ئەویش، ئەویش، ئەویش... بەدیهێنەرێکی هەیە، لە کوێ وەستاین، ئا ئەوە بەدیهێنەری ڕاستییە و زاتی (ئەللا)یە.

خۆ ئەگەر بوترێت ئەمە لە هیچ شوێنێکدا ناوەستێت و هەر درێژەی دەبێت، ئەوە دەبێت بە بێئەقڵی و ناماقووڵی، چونکە ئەو هزرەی لە هیچ شوێنێکدا ناوەستێت و پشت نابەستێت بە شوێنێك یان شتێك، دەبێت بە خولانەوە لە بازنەی بۆشدا، هەر لەبەر ئەمەش ناتوانێت قەناعەت بە خەڵکی بێنێت. بۆ ئەوەی ئەقڵ قبووڵی بکات، هەر دەبێت خۆی بداتە پاڵ شتێکەوە و لە شوێنێکدا ئۆقرە بگرێت. با بە نموونەیەك ئەمە ڕوون بکەینەوە...

## چی بزوێنەری شەمەندەفەر ڕادەکێشێت؟

کە ناوی نموونە هات، پۆل جوولەی تێکەوت. ئەمە وەك نەرمە شەپۆل دانێك، نیشانەی سەرنج نوێ کردنەوە بوو.

- ئازیزەکانم! ئایا لەوە گەیشتوون تا ئێستا باسمان کردووە؟

بێدەنگی قوتابییەکان، بە مانای "بەڵێ" دەهات. هیچ پرسیار نییە. کە وایە، با بچینە سەر نموونەکەمان:

- یەکێك کە لە ژیانی خۆیدا شەمەندەفەری نەبینیوە، دەیبەنە شار و بۆ یەکەم جار سواری شەمەندەفەری دەکەن. شەمەندەفەرەکە، قیتارێکی درێژی هەشتا فارگۆنییە. لە فارگۆنەکەی دوای دواوە دەست بە گێڕانی ئەم پیاوە دەکەن بەناو شەمەندەفەرەکەدا. لەم ئانوساتەدا شەمەندەفەرەکە دەکەوێتە بزووتن. کابرا کە لە فارگۆنێکەوە دەپەڕێتەوە بۆ یەکێکی تر، دەڕوانێت و دەڵێت:

- ئێستا زانیم، ئەم فارگۆنە بەوەی پێشییەوە بەستراوە و ئەو ڕایدەکێشێت.

کە دووەم فارگۆنیش تێدەپەڕێنێت، بە هەمان شێوە سەیر دەکات و هەمان ڕستە دووبارە دەکاتەوە.

- تێگەیشتم، ئەم فارگۆنەش ئەوەی پێشی ڕایدەکێشێت، چونکە بەوەوە بەستراوەتەوە.

بەم جۆرە دەگەڕێت دەگەڕێت، تا دەگاتە فارگۆنەکەی پێشی پێشەوە. لەوێشەوە بەرەو بزوێنەر (لۆکۆمۆتیڤ)ەکە...

ئێستا ئەگەر بێت و ئەم بابایە لە بزوێنەرەکە بێتە دەر و بەدوای شتێکدا بگەڕێت کە لەپێشی بزوێنەرەکەوە بێت و ڕایبکێشێت، کارێکی ژیرانەی کردووە؟ "چی ئەم بزوێنەرە ڕادەکێشێت؟". ئەو وەڵامە ژیرانەیە چییە، کە بۆ ئەم پرسیارەی ئەو کابرایە بدرێتەوە؟

بوراق، یەکەم کەس دەستی هەڵبڕی، هەر بۆیەش یەکەم قسە بەر ئەو کەوت:



● پرسینی: "کێ بزوێنەر ڕادەکێشێت؟" پرسیارێکی بێمانایە. چونکە ئەگەر بزوێنەرێك نەبێت کە ڕابکێشێت و ڕانەکێشرێت، شیرازەی شەمەندەفەر تێکدەچێت و لە جووڵە دەکەوێت. هەر بۆیە، ناچارین دان بە بوونی بزوێنەرێکدا بنێین کە فارگۆنەکانی پێوە بەسترابن.

- مامۆستا! کەس بزوێنەر ڕاناکێشێت. ڕاستییەکەی حەوجەی ڕاکێشان نییە. چونکە هێزی ڕاکێشان لە خودی خۆیدایە. ئەو هەر خۆی بەجوولەیە. کاری ڕاکێشانیش دەوەستێتە سەر ئەو.

- ئەی ئافەرین، بوراق!... بێگومان پرسینی: "چی بزوێنەر ڕادەکێشێت؟"، شتێکی بێمانایە، چونکە ئەگەر بزوێنەرێك نەبێت، کە ڕابکێشێت و ڕانەکێشرێت، شیرازەی شەمەندەفەر تێکدەچێت و جوولەی نابێت. لەم کلاوڕۆژنەیەوە ناچارین دان بە بوونی بزوێنەرێك دابنێین کە گشت فارگۆنەکانی پێوە بەند بێت.

باشە، ئەوکات بەم نموونەیە چیمان سەلماندووە؟

چاودێری پۆل داوای مۆڵەتی کرد و کەوتەگۆ:

- مامۆستا! لێرەدا فارگۆنەکان بەدیهێنراون. ئەگەر هەموو بەدیهێنراوەکان بە بەدیهێنەرێکەوە نەبەسترێنەوە، زریزەی هۆکارەکان درێژ دەبنەوە و لەبن نایەن، بەم جۆرە شتێکی نامەنتیقی و خولانەوە لە بۆشیدا دێتە ئاراوە. بەڵام ئەگەر لە شوێنێکدا بوەستێت و بە بەدیهێنەرێکەوە ببەسترێتەوە، ئەوا مەسەلەکە بە شیکارێکی مەنتیقی گەیشتووە.

- ئافەرین، چاودێر!... لێرەدا خاڵێکی زۆر گرنگتان بەبیر دەهێنمەوە، چونکە بە باس کردنی ئەم نموونەیە ڕێك کاتی هاتووە. بۆچی کە بزوێنەرەکە دەدۆزینەوە، ئیتر بەدوای کێشکەرێکی تردا ناگەڕێین؟ چونکە بزوێنەر بۆ ئەوەی بزوێنەر بێت، دەبێت هێزی

ڕاکێشانی هەبێت. بە دەستەواژەیەکی دیکە، بوون بە بزوێنەریی، خاوەنداریێتیی هێزی کێشکردنی شەمەندەفەر دەگەیەنێت.

بۆ نموونە: لە مرۆڤیشدا جۆرێك لە توانای بزووتن هەیە. مرۆڤی تەندروست، دەبزوێ، ڕێ دەکات و دەڕوات... ئایا ئەگەر ئادەمزادێك لە شوێنێکدا ببینین، دەتوانین لێی بپرسین:

– کێ تۆی هێنایە ئێرە؟



● بیرکردنەوە لەوەی کتێبێك هەر لە خۆیەوە جێبگۆڕێت چەند ناماقووڵ و بێجا بێت، بیرکردنەوە لەوەش کە خودا (حاشا) دروستکەرێکی هەبێ، هەزار جار لەوە ناماقووڵ و بێجاترە.

ئەمە پرسیارێکی ناماقووڵە، چونکە پێویستییەکی بونیادی مرۆڤ ئەوەیە بتوانێت لە شوێنێکەوە بچێتە شوێنێکی تر.

با بڵێین ئەوەی کە دەجووڵێت مرۆڤ نا، کتێبێکە... سەیر دەکەیت کتێبەکەی سەر ڕەحلەکەت، لەسەر مێزەکەی مامۆستایە... ئایا ئەو

کات پرسیارێکی وا: "کێ کتێبەکەمی لەسەر ڕەحلەکەمەوە بردووەتە ئەوێ؟"، ئاساییە یان نا؟

هەڵبەتە ئەم پرسیارە ئاساییە و ڕاستە، چونکە کتێب لە خۆیەوە ناتوانێت بچێتە ئەوێ. هەر دەبێت یەکێك هەبێت، گواستبێتییەوە و بردبێتییە سەر ئەو مێزە. پرسینی: "چی بزوێنەر ڕادەکێشێت؟" و "کێ هێناویەتییە ئێرە؟" چەند ناماقووڵ بێت، پرسیاری: "کێ خودای بەدیهێناوە؟"ش، هەر هیچ نەبێت ئەوەندە ناماقووڵ و نابەجێیە.

***

## زەوی لەسەر چییە؟

با نموونەیەکی تریش لەسەر ئەم بابەتە بێنینەوە:

با لە یەکێك، کە بەپێوە وەستا بێت، بپرسین:

– سەری تۆ لە کوێیە؟

– لەسەر جەستەمە.

– جەستەت لە کوێیە؟

– لەسەر قاچەکانمە.

– قاچەکانت لەسەر چین؟

– لەسەر زەوین.

– زەوی لەسەر چییە؟

– زەوی لەسەر هیچ شتێك نییە. ئەو دەتوانێت لە بۆشاییدا بوەستێت، بۆ وەستان پێویستیی بەوە نییە پشت بە هیچ شتێکەوە ببەستێت...

هەر وەك ئەوەی ناو ئەم نموونەیە، بوونی خودا لە زاتی خۆی، واتە خودی خۆیدایە. بوونی، پێویستیی بە غەیری خۆی نییە. بۆچی پێویستیی پێی نییە؟ چونکە هەبوون و خودا بوونی، مەزنترین و گەورەترین شتە. هەر بۆیەش لە هەموو کەموکوڕی و نوقسانییەك بەدوورە و لەوە بەرزترە. پێویستییش بە غەیر، نوقسانی و کۆڵەوارییە. هەڵبەتە ئەوەی خاوەنی کامڵترین بوونە، لەم نوقسانیی پێویستی بە غەیرە، بەدوورە. هەر بۆیە، پرسیاری: "کێ خودای بەدیهێناوە؟"، هی کردن نییە. ئەگەر بکرێت، مانای وایە نوقسانیی پێدراوە، ئەمەش وەستان دژ بە مەنتیق دەگەیەنێت.

## شەکر چۆن دروست کراوە؟

زانینی دونیا و ئەو کاڵا و ڕووداوانەی لە سەریدا دەگوزەرێن لە هۆکارەکان –وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا– شتێکی لەنگ و بێمانای لێدەکەوێتەوە. بۆ نموونە: سەیری سێوێك بکەن، سێو. ئەم سێوە لە دارسێو بەرهەم دێت –کە وەك کارگەیەکی سێو کار دەکات–. هەر چی دارسێوەکەشە، لە کارگەی گەردوون بەرهەم دێت. واتە گەلێك

شت پێویستە بۆ بەرهەم هاتنی، هەر لە خۆڵ و ئاوەوە تا دەگاتە هەتاو و هەوا و گەلێك شتی تریش. باشە ئەی کارگەی بەرهەمهێنی ئەو گەردوونەی ئەم هەموو شتە لەخۆ دەگرێت، چییە؟ ئەگەر بۆ ئەمەش کارگەیەك بدۆزینەوە، ئەم جارە دەکەوینە حاڵەتی گەڕان بەدوای کارگەی ئەو کارگەیەوە. ئیتر ئەم کاری دۆزینەوەی کارگەیە، ئابەوجۆرە درێژە دەکێشێت. کەی لە خاڵێکی ڕاستەقینە کۆتایی پێدێت؟ تەنها ئەو کاتەی قبووڵ بکرێت کە جێدەستی خاوەن زانست و هێزێکی بێکۆتایە، ئەوکاتە شیکارێکی ئاقڵانە دۆزراوەتەوە. ئەگەر نا وامان لێدێت، بێوچان هەر بێین و بچین و نەتوانین ئۆقرە بگرین.

نموونەیەکی تر: با بیر لە شەکر بکەینەوە... شەکر چۆن بەرهەم دێت؟ بەڵێ، کێ پێمان دەڵێت؟

– بڵێ عەلی! شەکر چۆن بەرهەم دێت؟

– لە کارگەی شەکر بەرهەم دەهێنرێت.

– باشە، کارگەی شەکر چۆن بە بەرهەم دێت؟

– لەو دەزگایانەدا دێتە دروست کردن کە ئامێرەکانی کارگەی شەکر دروست دەکەن.

– باشە، ئەی ئەو دەزگایانە چۆن دێنەبوون؟

– لە دەزگای تردا دروست دەکرێن.

– ئەو دەزگایانەی تر چۆن دروست دەکرێن؟

عەلی دەستی بە پێکەنین کرد.

هەڵبەتە عەلی بەو پێکەنینەی مەبەستی ئەوە بوو کە بێدەنگ بوون باشترین شتە، چونکە ئەو لاوێکی ژیر بوو، دەیزانی ئەگەر لە شوێنێکدا نەیبڕێتەوە و نەیداتە پاڵ کەسێکەوە، بە شێوەیەکی بێکۆتا درێژە دەکێشێت و جەنجاڵییەکی زنجیرەی هۆکارەکان لە بەردەمیدا دروست دەبێت.



● وەك چۆن مەحاڵە کەسێك نەبێت ئەم کارگەیەی دروست کردبێت و دایمەزراندبێت، ئاواش لێکچوواندنی ئەو کەسە بەو کارگەیەی دروستی کردووە مەحاڵە.

ژیرانەترین وەڵام بۆ ئەوە، ئەوە بوو دان بەوەدا بنرێت کە ئەو دەزگا کارگە دروستکەرانە، لە زەینێکەوە دەرچوونە، واتە داننان بەوەی جێدەستی وەستایەکن، کە بیری لێکردوونەتەوە و دروستی کردوون.

# کێ نووسینەکەی نووسیوە؟

با سەیری نووسراوێك بکەین و بەسەرە بەدوای ئەوەدا بگەڕێین کە کێ پێی هەڵساوە.

– چی نووسیویەتی؟

– قەڵەم نووسیویەتی.

– چی قەڵەمەکەی بەنووسین هێناوە؟

– ئەو پەنجانەی گرتوویانە...

– چی پەنجەکانی ڕاگرتووە؟

– دەست ڕایگرتوون.

– چی دەستی ڕاگرتووە؟

– قۆڵ گرتوویەتی.

– چی قۆڵی ڕاگرتووە؟

● نووسین لە زانینەوە سەرچاوە دەگرێت، واتە ئەوەی لە بنەڕەتدا نووسین دەنووسێت، زانینە. هەرچی قەڵەمە، هۆکارێکی نووسینە.



- جەستە ڕایگرتووە.

بەم شێوەیە، مەسەلەکە لە ڕێی ڕاستی خۆی لا دەدات بێئەوەی ئەوە بدۆزینەوە کە کێ نووسینەکەی نووسیوە. ئەمە لە حاڵێکدایە کە نووسراوێکی مانادار لە زانینەوە سەرچاوە دەگرێت، واتە ئەوەی نووسیویەتی زانینە، ئایا دەتوانرێت بوترێت: "ئەی کێ زانینی نووسیوە؟"

لەم نموونانەوە بەڕوونی دەردەکەوێت، کە ئەوەی بوونەوەران بە شێوەیەکی زریزەیی یەکتریان بەدیهێنابێت هی وتن نییە. هەر دەبێت بەدیهێنەرێك هەبێت، کە هەموویانی بەدیهێنابێت و خۆی بەدینەهێنرابێت. دەنا لەنگییەکی نامەنتیقی مرۆڤ تووشی دۆش دامان دەکات و نایەڵێت بە ئەنجامێکی مەنتیقی بگات.

ئینجا، ئایا کەسێکی ژیر دەکرێت باوەڕ بەوە بێنێت هۆکارەکان بەدیهێنەرین؟ واتە ئایا زنجیرەی هۆکارە بێئەقڵ و کەڕ و کوێر و نەفام و کلۆڵەکان، دەتوانن ئەو بوونەوەرە ماناداره ڕێکوپێکانەی پێکەوە هەڵدەکەن، بێننە ئاراوە؟

ئایا هەرچی خاوەن ئاوەز هەیە، بەو پێیەی ناتوانێت هۆکارەکان وەك بەدیهێنەر نیشان بدات، ناچار نییە دان بەوەدا بنێت کە خاوەن زانست و هێزێکی بێکۆتا - کە ئەڵڵایە، هۆکارەکانیشی بەدیهێناوە؟

***

بەم جۆرە، یەکێکی تر لەو بابەتانەی زۆر لەسەری وەستاین بە دەنگی زەنگ بەکۆتا هات. بەڵام ئەرکێکم بە قوتابییەکان دا، وتم: "ئێوەش لەم بابەتە بکۆڵنەوە و ئەو نموونانەی دەستتان دەکەوێت بیاننووسنەوە، لە وانەی داهاتوومان‌دا پێتانی دەخوێنمەوە."

## نموونەکانی عائیشە و بوراق

بۆ هەفتەی دواتر، (بوراق) دوو نموونە و (عائیشە)ش یەکێکی دەست کەوتبوو. لە پۆلدا پێم خوێندنەوە و بە قوتابییەکانیشم نووسینەوە. بوراق دوو نموونەکەی لە کتێبدا دۆزیبووەوە، بەم جۆرە کەوتە باس کردنیان:

– با بیر لە یەکێك بکەینەوە کە لەبان کورسییەك دانیشتووە...



● بۆ ئەوەی کورسییەك یان تەپڵەیەکی بێپێ بەپێوە بوەستێت، هەر دەبێ بدرێتە پاڵ شتێکەوە. ئەگەر نا، ژمارەیان هەرچەند بێت، هەر بەلادا دێن و دەکەون.

بەڵام کورسییەکە، قاچەکانی دواوەی نییە. کورسییەکە خراوەتە پاڵ کورسییەکی ترەوە تا نەکەوێت. بەڵام ئەویش وەك خۆی دوو قاچی هەیە. ئەویش خراوەتە پاڵ یەکێکی تر، کە وەك خۆی قاچەکانی دواوەی نییە... بەم جۆرە، ئەم زنجیرەیە دەڕوات، بۆ ئەوەی هەموو ئەم کورسییانە بتوانن لەسەر پێ بوەستن، ئایا پێویست ناکات لە کۆتادا کورسییەك هەبێت قاچەکانی دواوەی هەبێت و بەتەواوی لەسەر ئەرز دابنیشێت؟ ئەگەر نەخرێنە پاڵ کۆڵەکەیەکی واوە، کورسییەکان هەر چەند زۆر بن گشت پێکەوە بەلادا دێن.

وەك ئەم نموونەیە، ئەگەر هۆکارەکانیش نەدرێنە پاڵ یەکێك واتە ئەگەر نەدرێنە پاڵ کردگارێك کە هەموو شتێکی لە نەبوونەوە هێنابێتە بوون، ناماقووڵییەکی زریزەیی دەکەوێتەوە.

● با لەسەر کاغەزێك، ئەوەندەی دەمانەوێت سفر بنووسین. بەهای ئەم سفرانە چییە؟ هیچ. ئەگەر لەلای چەپیان ژمارەیەکی جیا لە سفر نەنووسرێت، ناتوانرێت باس لەوە بکرێت کە بەهایەکیان هەیە.

ئەمەش نموونەیەکی ترە: با لەسەر کاغەزەکەی بەردەممان، سفرێك بنووسین. نرخی ئەمە چەندە؟ تا ئەو کاتەی ژمارەیەکی تر لەوسەرییەوە دەنووسرێت، نرخەکەی هەر سفرە. ئەگەر ژمارەیەك لەلای چەپی سفرەکەوە نەنووسین، با سفرەکان هەر زیاد بکەین ئایا نرخەکەی دەگۆرێت؟ حەز دەکەیت با تریلیۆنێك جار تریلیۆنێك سفر بنووسین و لەدوای یەك ڕیزیان بکەین... تا ئەو کاتەی ژمارەیەك لە لای چەپییەوە نەنووسین ئەمانە هیچ نرخێکیان نییە. چونکە: "گردبوونەوەی هەموو ئەوانەی هەمان شتیان کەمە و لە هەمان تایبەتمەندیدا دەستەوسانن لە زیادبوونی پێویستی و دەستەوسانییەکەیان بەولاوە شتێکی تریان لێشین نابێت."



● جەماعەت شوێنی ئیمام دەکەوێت، ئیمامیش شوێنی هیچ کەس ناکەوێت. خۆ ئەگەر شوێن یەکێکی دی بکەوێت، دەبێت بە مەئمووم نەك ئیمام.

کەوابوو، بۆ ئەوەی نرخێکیان پێ بەدەست بخەین پێویستە ئەو سفرانەی وەك یەکن بدەینە پاڵ ژمارەیەکی ترەوە.

وەك لەم نموونەیەشدا دەبینرێت، پێویستە زنجیرەی هۆکارەکانیش بە بەدیهێنەرێکەوە ببەسترێنەوە. چونکە بەدەست خستنی ئەنجامی ماقووڵ و مانادار لە هۆکارە نەفام و نابینا و کەڕەکانەوە، تەنها لە ڕێی خستنە پاڵ بەدیهێنەرێکی خاوەن زانست و دەسەڵاتەوە مومکینە.

ئەو نموونەیەی کە عائیشەش دۆزیبوویەوە، ئەمەی پشت ڕاست دەکردەوە. ئەو کتێبەی ئەو خوێندبوویەوە، باسی لە بەسەرهاتێك دەکرد کە بەسەر (ئەحمەق عەبدی)دا هاتووە:

"ئەحمەق عەبدی یەکەم جاری بوو بچێت بۆ مزگەوت و نوێژی بەکۆمەڵ بکات. سەیری کرد هەموو جەماعەتەکە پابەندیی لەو تاکە پێشنوێژە دەکەن کە لەپێشیانەوەیە. پێشنوێژەکە چۆن بجووڵێتەوە، ئەوانیش هەر وا دەکەن.

ئەم پابەندییەی جەماعەت بە پێشنوێژەکە، ئەقڵی لێ تێکدا. دوای نوێژ، لە حەوشەی مزگەوت چووە لای پێشنوێژەکە و پرسیارە تایبەتەکەی خۆی لێکرد:

- مەلا فەندی! هەموو جەماعەت پابەندی لە تۆ دەکەن، ئەی تۆ پابەندی لە کێ دەکەیت؟

مامۆستا وەڵامی دایەوە:

- کوڕی خۆم! جەماعەت پابەندی لە پێشنوێژ دەکەن، بەڵام پێشنوێژ پابەندی لە کەس ناکات. ئەگەر بێت و پابەندی لە کەسێکی

تر بكات، نابێت به پێشنوێژ، دەبێت بە یەكێك لە جەماعەت. واتە وەك چۆن مەرجی پێشنوێژی ئەوەیە پابەندی كەسی تر نەبێت، ئاواش مەرجی جەماعەت ئەوەیە پابەندی پێشنوێژ بن."

ئیتر، به پشت بەستن بە زانیارییەكانی پێشوو، تەواوی پۆلەكە لەو ئەنجامە گەیشتبوون كە دەخوازرا لەو ڕێیەوە ڕوون بكرێتەوە.

## فێڵێكی شەیتان

### ئایا دەشێ مادده ئەزەلی و ئەبەدی بێت؟

بەر لەوەی بابەتەكە بە كۆتا بێنین، سەرنجم بۆ خاڵێكی تر ڕاكێشان:

– ئازیزەكانم! ئەم پرسیارە، لە بنەڕەتدا فێڵێكی شەیتانە. بەشێوەیەكی گشتی لەلایەن كەسانی باوەڕ لاواز یان بێباوەڕەوە، ناوبەناو دەخرێتە ئاراوە، مەبەستیش لێی سەر لێشێواندنی مێشك و دەروونەكانە. ئەوانەی باوەڕیان بە بەدیهێنەریی خودا نییە، بانگەشەی ئەوە دەكەن كە مادده و هۆكارەكان ئەزەلی و ئەبەدین. واتە مادده بێ سەرەتا و كۆتایە. هەر بۆیەش دەبێ ئەو هۆكارانەی لێیانەوە هاتوونەتە ئاراوە، بێسەرەتا و بێكۆتا بن. ئەمە لە كاتێكدا كە بێسەرەتایی و بێكۆتایی، سیفەتی خودای گەورەن. مانای وایە

**ئەوانەی دان بە خودادا نانێن، سیفەتەکانی دەبەخشنە ماددە کوێر و کەڕ و بێماریفەتەکان.**

بەپێی پێشکەوتنە زانستییەکانی ئەمڕۆ، ئەم بۆچوونە زۆر هەڵـە و بێبنەمایە، چونکە ئەوەی کە ماددە ئـەزەلی و ئەبـەدی نییـە و ڕۆژێـك هەر کۆتایی پێدێت، وەك ڕاسـتییەکی بنـبڕ سـەلمێنراوە. بـۆ نموونـە: (جـۆن سـی)ی زانـای کیمیـا، لـە شـاکاری «**لـە چـاخی قەڵـەمڕەویی زانستدا، بوونی خودا دێتە سەلمان**»دا دەڵێت:

"زانستی کیمیا ئـەوەمان پێدەڵێت کـە هەنـدێك لـە ماددەکـان لـە لەناوچـووندان. لــە کاتێکـدا کــە هەنــدێك مــاددە بــەخێرایی بــەرەو لەناوچوون دەچن، بەشێکی تریان هێدی هێدی بـەرەو پـیری دەچـن. بۆیە ماددە بێ کۆتایی نییە."

شتێك بێ کۆتایی نەبێت، بێ دەسـتپێکیش نابێـت. بۆیـە سـیفەتی ئەزەلێتی و ئەبەدێتی –کە هی خودان– ناکرێت بە غەیری ئەو بدرێن.

هەر لە هەمان شاکاردا، (ئی. ویلیەم)ی زانای فەلەکناس دەڵێت:

"**... زانستی فەلەکناسی، ئاماژە بەوە دەدات کە ئەم گەردوونـە بێ هیچ گومانێك، خاوەنی ڕابردوویـەکی کۆنـە و ڕوو لـە کۆتاییـەکی قەتعییــە. باوەڕپوونمــان بــەوەی ئــەم گەردوونــە ئەزەلییــە و دەستپێکێکی نییە، وێڕای بەڵگـە یەکلاکـەرەوەکانی بەردەسـتمان، شـتێکی بـەجێ نییـە، چـونکە لەسـەر بنـەمای گـۆڕانێکی بـەردەوام بنیاتنراوە.**"

کەواتە ئەو هێز و دەسەڵاتەی ئەم گەردوونەی -کە زانایانیش سەلماندوویانە دەستپێکێکی هەیە و ڕۆژێك هەر دوایی دێت- بە دەستپێك هێناوە و ڕۆژێکیش بە کۆتای دێنێت، هی کێیە؟

ئەگەر بە "ئەو خودایەی کە کردگارێکی خاوەن زانست و هێز و دەسەڵاتی بێکۆتایە" وەڵام نەدەینەوە، بارمان گران دەبێت. چونکە ڕزگاربوونمان لەو زنجیرە بێئەقڵی و نامەنتقییەی خۆی بۆ مەلاس داوین، مەحاڵ دەبێت.

**بە باوەڕی بێکۆتا و پشت بەستنمان بەم بەدیهێنەرە مەزنە، بەسەر گشت جۆرە گومانێکدا زاڵ دەبین و دەتوانین بگەین بە ئاسوودەییەکی بێوێنە.** سەیر بکەن، پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێبێت) بەر لە چەند سەدەیەك چەند بەڕوونی ئاماژەی بەمە داوە:

**"شەیتان دێتە لاتان و دەڵێت خودا دونیای بەدیهێناوە، ئەی کێ خۆی بەدیهێناوە، بەم جۆرە وەسوەسەتان بۆ دروست دەکات. کاتێك ڕووبەڕووی وەسوەسەیەکی وەها بوونەوە، بڵێن:**

**- من باوەڕم بە خودا و پێغەمبەرەکەی هێناوە، شەیتان! بەخۆڕایی خۆت بە منەوە خەریك مەکە."**



# شەو و ڕۆژە پیرۆزەکان

## کاتە پڕفەڕەکان

**هەر شەوێك کە پێی دەگەیت بە شەوی قەدر و هەر کەسێکیش کە پێی دەگەیت بە خدری زیندەی بزانە.**

دوا پۆلی بنەڕەتی، وەك بڵێی یەکەم هەنگاوی گەنجێتییە. پرسیاری قوتابییانی ئەم تەمەنە - کە دەکرێ بە تەمەنی گەیشتن بە گەنجێتیش دابنرێت - گەلێك جار فرە سەرنج ڕاکێشە. پۆلی نۆی بنەڕەتی و دەی ئامادەیی، ئەو پۆلانەن کە زۆرترین و جیددیترین پرسیاریان تێدا دەکرێت. چونکە قوتابییانی ئەو قۆناغانە بەڕاستی بە نیازی فێربوون دەپرسن... لەوە بەولاوە ئامانجێکی تریان نییە.

یەکێك لەو پرسیارانەی لە یەکێك لەو پۆلانەدا لێم کرا، ئەمە بوو:

- "مامۆستا! ئایا بەپێی ئاینی ئێمە، کات و ساتی پڕفەڕ و بێفەڕ هەیە؟"

من وا وەڵامی ئەم پرسیارەم دایەوە کە هەموو کاتێك پڕفەڕ و بەهادارە. پێویستە هەموو چرکە ساتێك بە گەنجینەیەکی گران بەها بزانرێت و سوودی لێوەربگیرێت. هەر لەم سۆنگەیەشەوە، وتەیەکی جوان و پڕمانا لە زمانەکەماندا جێی کراوەتەوە:

"هەر شەوێك کە پێی دەگەیت بە شەوی قەدر و هەر کەسێکیش کە پێی دەگەیت بە خدری زیندەی بزانە."

چەند ڕۆژێك دوای ئەم قسە و باسە، دەرسمان گەیشتە بابەتی «شەو و ڕۆژە پیرۆزەکان». قوتابییەکان ئەو بابەتەیان خوێندبووەوە و شرۆڤەیان دەکرد. باسی گشت ئەوانەیان کرد کە فێری ببوون دەربارەی گرنگی و پیرۆزیی ڕۆژی هەینی، ڕەجەب، میعراج، شەوی بەرات و قەدر و ئەو پەرستشانەی وا چاکە تێیاندا بکرێت.

ئەحمەد کە لە قوتابییە زیرەکەکانی پۆل بوو، داوای مۆڵەتی قسەی کرد:

- "مامۆستا! بەڕێزت چەند ڕۆژێك لەمەوبەر باسی ئەوەت کرد کە هەموو ئەو کاتانەی تێیاندایین، پیرۆز و گران بەهان. تۆ وتت هەموو کاتێکتان بە «قەدر» بزانن، چونکە هەمووی خودا بە قسمەتی کردووین. بەڵام وا ئێستا هاوڕێیان باس لەوە دەکەن کە هەندێك شەو

لەوانی تر پیرۆزتر و بەهادارترن. تۆش ئەم قسانەیان بە ڕاست دادەنێیت. کتێبەکەشمان هەر وا دەڵێت. ئایا ئەمە دژیەکی نییە؟"

– ئەمە دژیەکی و یەك نەهاتنەوە نییە. وەك پێشتریش پێم وتن، هەموو کاتێك لە گران بەهاترین ئەو شتانەیە کە خودا بە مرۆڤی بەخشیوە، چونکە هەموو شتێکی گران بەها، بە کات و لەناو کاتدا بەدەست دەهێنرێت. هەر لەم سۆنگەیەوەیە باب و باپیرانمان



● لە شەوە پیرۆزەکاندا، لە مزگەوتەکاندا چرا دادەگیرسێنرێت، تا بەها و پیرۆزیی ئەو شەوانە بەبیر موسوڵمانان بهێنرێتەوە.

فەرموویانە "وقت نقدة" – واتە کات پارەیە، هەموو کات و ساتێك وەك پارە و بگرە زیاتریش بەنرخە.

لەم ژیانی دونیایەدا هەر کەسە و بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دەژی. ئەم ماوە دیاریکراوە بێ هیچ گومانێك ڕۆژێك دەبڕێتەوە. کەوابوو ئایا پێویست ناکات ئەو کاتەی کە ڕێژەیەکی دیاریکراومان لێی پێبەخشراوە بەباشی بنرخێنین؟

ئینجا، بۆچی و لەبەرچی بەشێکی ئەم کاتە زۆر سنووردار و زۆر بەهادارە بە بێبەها و بێفەڕ بزانین؟

کاتێك نییە، بێفەڕ و بێنرخ بێت. بەڵام کاتی بەنرختر و سەنگینتر هەیە. ئەگەر بێین و بە نموونەیەك کە لە باسێکی تریشدا بۆم باس کردوون، ڕوونی بکەینەوە، دەتوانین بڵێین: گشت پێغەمبەرەکان (سەلامی خوایان لەسەر بێت) لەوەی کە نێردەی خودان، هاوشانن. لە ڕووی ئەرکی پێغەمبەرایەتییەوە جیاوازی لەنێوانیاندا نییە. بەڵام پێغەمبەرەکەی ئێمە – موحەممەد (دروودی خودای لێبێت)– لە هەموویان سەنگینترە. واتە هەموو پێغەمبەرەکان بەڕێز و سەنگینن، بەڵام پێغەمبەری ئێمە کە دوا نێردەی خودایە، لە گشتیان گەورەتر و سەنگینترە.

هەر وەك ئەمە، گشت کات و ساتەکان بەنرخن، بەڵام هەندێك شەو و ڕۆژ لەوانی تر بەنرخترن. سەرباری ئەوەی کە ئەم شەو و ڕۆژانە، هەندێك ئەرکی گرنگ بەبیر مرۆڤ دێننەوە. دەتوانین ئەو ئەرکە گرنگانەی کە ئەم شەو و ڕۆژانە بەبیر مرۆڤایەتیی دەهێننەوە، لە سێ خاڵدا کۆ بکەینەوە:

١– هەر یەکێك لەمانە، ساڵیادی ڕووداوێکی مێژوویی یان ئایینیی زۆر گرنگە. بۆ نموونە: شەوی قەدر ساڵیادی یەکەم دابەزینی کتێبە پیرۆزەکەمان – قورئانە بۆ سەر زەوی. شەوی میعراجیش ساڵوەگەڕی بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان و گەڕانەوەی پێغەمبەری

خۆشەویستمانە(دروودی خوای لەسەر بێت)، لە ماوەیەکی فرە کورتدا.

٢- ئەم شەو و ڕۆژە پیرۆزانە، کاریگەرییەکی شۆک ئاسایان هەیە لە دەرهێنانی مرۆڤ لەو ژیانەی کە ڕەوتی هەموو ڕۆژێکی وەك یەکە. هەموو کەسێك لە کات و ژیان ڕادێت. تەنانەت ڕەنگە بەهۆی خوودانە ژیانێك کە بەردەوام ئاوایە، باوەش بە دونیادا بکات و ڕۆژی پەسلانی بیر بچێتەوە. چونکە مرۆڤ لە بەرانبەر ڕووداوگەلێك کە بە هەمان شێوە دووبارە دەبنەوە، تووشی وابەستەیی دێت و لێی ڕادێت و سەری لێ تێکدەچێت... شەوێك یان ڕۆژێکی پیرۆز کە لەم نێوانەدا دێت، دەبێت بە ئاگادارکەرەوەیەك و لەم سەرلێشێوان و بێسەروبەرییە دەریدەهێنێت.



● شەوی قەدر، ساڵوەگەڕی دابەزینی کتێبە پیرۆزەکەمان -قورئانە- بۆ سەر زەوی.

بۆ نموونە: هاتنی شەوێکی پیرۆز، ئەو کەسە ڕادەچڵەکێنێت کە ڕۆژی دواییی لەبیرچووەتەوە و پێی دەڵێت: "ڕابە، بڕوانە شەوی بەرات هاتووە. خۆت ئامادە بکە. وا بکە ئەم شەوت جیا بێت لە شەوانی ترت. پەرستش و ئەرکە ئاینییەکانت، بەبیر خۆت بێنەوە. دوور بکەوەوە لەو کارە بەدانەی خودا قەدەغەی کردوون. یادی مردن و ڕۆژی دوایی بکەوە... ئەمە هەلێکە بۆ لەکۆڵ

کردنەوەی باری گوناهەکانت و بێبەری بوون لێیان. هەلێکە دووبارە نابێتەوە دەی بکەوە کار!"

بەم هۆشیاری دانە، مرۆڤ هەوڵ دەدات ئەگەر خۆی چاك بێت چاکتر و ئەگەر حاڵیشی خراپ بێت، گوناهەکانی کەم بکاتەوە و خۆی رزگار بکات...

٣- هەموو شەو و رۆژێکی پیرۆز، وەك بڵێیت پێشانگای داشکاندنی مەعنەوییە. ئەوە نییە ناوبەناو دەبینین پێشانگا دەکرێتەوە. ئەمانە پێشانگای داشکاندنی ماددین. بۆ نموونە: با بڵێین پێشانگایەکی جلوبەرگ دەکرێتەوە و تێیدا کراس بە هەزار دینار و پانتۆڵیش بە سێ هەزار دەفرۆشرێت. ئایا ئەم هەلە لەکیس خۆتان دەدەن؟ یانیش بە کەسێك کە بڵێت: "گیانەکەم! چ کارم بەو پێشانگایەیە، تێیهەڵدە." دەڵێن ژیر؟

شەو و رۆژە پیرۆزەکانیش پێشانگای داشکاندنی مەعنەویین، بە رێژەیەکی گەلێك زۆرتر لەوەی ناو ئەم نموونەیە. چونکە لەو شەو و رۆژە پیرۆزانەدا، لێبوردن و بەزەییی بێسنووری خودایی دادەبەزن بۆ سەر مرۆڤایەتی... پەرستشەکان خێری زیاتر بەدەست دەخەن. بە کاری کەم و بە نرخی هەرزان قازانجی زۆر بەدەست دەهێنرێت. تەنانەت یەك شەوی قەدر، لە رووی قازانجەوە، لە هەزار مانگ خێرترە... مانای وایە کەسێکی باوەڕدار، تەنها بە پەرستشەکانی

یەك شەوی قەدر، خێری تەمەنێکی زیاتر لە ٨٣ ساڵەیی بەدەست دەهێنێت. لە سوورەی قەدری قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەمە دراوە.

موسوڵمانێك ئەم ڕاستییانە بزانێت و باوەڕی پێیان بێت، چۆن هەست بە گەورەیی ئەو شەو و ڕۆژانە ناکات و نایانقۆزێتەوە؟ کەواتە وەك چۆن قۆستنەوەی ئەو پێشانگایانەی لە میانەیاندا کەلوپەل زۆر بە هەرزانی دێتە فرۆشتن و کەرەستەیەکی زۆر بە پارەیەکی کەم دەکڕێت، ژیریی بێت، ئاواش خەو نەدانە خەو لەو شەوانە – کە پێشانگای هەڕاجی مەعنەوییین– و سوود وەرگرتن لێیان، ئەوەندە ژیرییە...

ئەگەر بمانەوێت باسەکە پوخت بکەینەوە، دەبێت بڵێین: پێویستە شەو و ڕۆژی پیرۆز لەناو کاتەکاندا هەبن، چونکە ئەم شەو و ڕۆژانە هەر بەوە ناوەستن کە خۆیان بەرز و سەنگین ڕابگرن، بەڵکو وا دەکەن ئەو دەروونانەی بەهۆیانەوە بێدار دەبنەوە، لە ڕۆژانی دواتریشدا درێژە بە ڕەفتارە جوان و کارە بەکەڵك و پەرستشەکان بدەن. واتە بۆی هەیە ئەو کارە جوانانەی لەو ڕۆژە تایبەتانەدا دەست پێدەکەن، لە ڕۆژانی دوای ئەوانیشدا درێژەیان ببێت. ئەمە جگە لەوەی ئەو ڕووداوە گرنگە ئاینییانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ ئەم ڕۆژە دیاریکراوانە، بەهۆی ئەوەی بە ڕۆژژمێری کۆچین، بە هەموو مانگ و وەرزێکی ساڵدا دەسووڕێنەوە. بەم جۆرەش جوانییەکانی ئەو ڕووداوە پیرۆزانە بە هەموو کاتەکاندا دەگەڕێن. بۆ نموونە: مانگی





● شـــەو و ڕۆژە پیرۆزەكـــان پێشانگاگەلێكی مەعنەوین، كە بە كـەمترین كـار زۆرتـرین خێـر بەدەسـتی مرۆڤـ دەخـەن، ڕێـك وەك پێشانگاكانی داشكاندن...

ڕەمـەزان، بـەوەی سـاڵی (دە) ڕۆژ دێتـە پـێش، بـە هـەموو مـانگ و وەرزێكی ساڵدا دەگەڕێت. بەم شێوەیە جوانی و بەرەكـەتی ڕەمـەزان سەرجەم مانگ و وەرزەكان شكۆمەند دەكات. خۆ ئەگەر سەیر بكـەن دەبیـنن خـووی جـوانی پەرسـتش كـردن كـە لـە ڕەمەزانـدا دەسـت پێدەكات، لە مانگەكانی تریشدا بەردەوامیی دەبێت...

مانای وایە، مەبەست لە هەڵبژێررانی هەندێك شـەو و ڕۆژی پـیرۆز، پیرۆز كردنی ڕۆژ و زەمەنەكانی تریشە.





## هاواری نەوەیەك

### دووەم نامەی (ئەسەنگوڵ)

دووەم نامە کە لە (ئەسەنگوڵ)ەوە پێم گەیشت، تاساندمی و خستمیە بیرکردنەوەی قووڵەوە. پێشەکییە درێژەکەی نامەکە دەخەمە لاوە و ئەو دواکەی وەك خۆی بڵاو دەکەمەوە. نازانم، ئەمە دەنگی نەوجەوانێکە کە تازە چووەتە پۆلی یازدەیەمەوە، یان هاوار وناڵەی نەوەیەکە؟

"- مامۆستا ئازیزەکەم!

... ئیتر وا خەریکە نغرۆ دەبم. خوازیاری ئەوە نەبووم لە بیر و باوەڕەکەی تۆ داببڕێم. چونکە لەو بیر و باوەڕانەوە ئاسوودەیی و

خۆشنوودیم دەست کەوتبوو. وەلێ هەست دەکەم ئەو دەنگەی دەورووبەرەکەم، کتێبەکانم، خانەوادەکەم، هاوڕێکانم، کەسە نزیکەکانم و تەنانەت ناخی خۆشم کە گاڵتەم پێدەکات و ڕووەو هەوەسبازی و ڕابواردن و، کورتییەکەی ژیانێك کە نەڵێم ئەمە حەڵاڵە و ئەوە حەرامە هەڵمدەنێت، ڕۆژ بە ڕۆژ گڕی ناخم زیاتر کلپە دەسێنێت و هەست دەکەم خەریکە دەبێتە مەترسییەك بەرگەی نەگیرێت.

ڕۆحم لەژێر گوشینێکی بێڕەحمانەدا دەناڵێنێت. مێشکم، خەریکە لە تاو ئەم ئازارە بتوێتەوە و وەك خوێن دڵۆپ دڵۆپ بچۆڕێت و نەمێنێت. ئێستا بمبینیت، نامناسیتەوە، ئەوەندە لەڕ و لاواز بوومە... بوومەتە کەسێکی ئەوەندە بێهێز و ماندوو، دەڵێی لەپڕ بەساڵدا چووم...

ئەم نامەیە، هاوارێکە بۆ بەهاناوە هاتن، بەڵام دوور نییە دوا هاوار بێت. چونکە توانای نووسین و توانای هاوار کردنم نەماوە. خەریکە چۆکم دەشکێت. ئالای خۆ بەدەستەوەدان، لە خەونەکانمدا هەڵدەکەم و چوومەتە ناو گوناهانەوە. بە سەرسوڕمانەوە لە خۆم دەپرسم: "دەڵێیت بیریی ئەو کەمە گوناهە دەکەم کە لە ژیانی ڕۆژانەمدا لە دەستیان هەڵدێم؟" دەبێ ئەو بیرکردنەوانە نەبن کە لە خەونەکانمدا گیانیان بەبەردا دێتەوە و دەبووژێنەوە؟ ئیدی بێزار بووم لە خەوبینین بە مۆتەکەوە و بێداربوونەوە بە ترس و فیزاحەوە.

ئاوا بە دوور و درێژی بۆت دەنووسم، بۆ ئەوەی ئەگەر چیی تر ئومێدێك بە من مابێت پێمی ڕابگەیەنیت.

مانای ئایەتێك کە سەردەمانێك تۆ لە لاپەڕە زەرد هەڵگەڕاوەکانی دەفتەرەکانماندا پێت نووسینەوە دەستم دەگرێت، بەڵام نازانم تا کەی ﴿لاَ تَيْئَسُوا مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِنَّهُ لاَ يَيْئَسُ مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الْكَافِرُونَ﴾ یوسف:٨٧، واتە: " هەرگیز لە میهرەبانیی خودا نائومێد مەبن. بەڕاستی کافران نەبێ کەس لە میهرەبانیی و لوتفی خودا نائومێد نابێ.."

کە تۆم بەبیر دێتەوە پەشیمان دەبمەوە لە گوناهکاری. باوەڕ دەکەیت، هەندێك جار دەمەوێت لە خەیاڵم دەرت بکەم. دەڵێم لاچۆ لەسەر ئەو ڕێیانەی بەرەو گوناه دەڕۆن، تا بتوانم بەئاسانی بۆی بچم. ئەگەرچی حەزیش ناکەم، بەڵام هەر دەرتدەکەم، خۆت و هزرەکانت... بەڵام ئەو ڕووە



هەمیشە خۆش و دەم بە خەندە و پێکەنینەی تۆ، لە پێشم لا ناچێت. ڕێم بۆ چۆڵ ناکەیت، هەر دەڵێیت نا (ئەسەنگول)، نا.. نا!... تا

بەسەر مندا نەڕۆیت و پانم نەکەیتەوە، ناتوانیت بەو ڕێیەدا بڕۆیت بەرەو گەلەریی گوناهەکان...

مامۆستا گیان! ئەم جارەیان بەڕاستمە، دە چی دەبێت، پێشم بەربدە. ئەم جارەیان ئەگەر پێویست بە پان کردنەوەش بکات، دەیکەم تا بەسەرتدا تێبپەڕم... چی دەبێ، دە پێشم بەربدە و یەخەم بەر بدە. تازە خۆ وا حسێبە من ئەو گوناهانەم ئەنجام داوە، مادام حەزم پێیانە و شەیدایانم.

چی دەبێ وازم لێبێنە، با هەر هیچ نەبێ لە گوناهی پان کردنەوەی تۆ ڕزگارم ببێ. هەندێك جار دەڵێم: ئاااخ! لە کوێ تۆم ناسی و بۆ گوێم لێگرتی؟... خۆزگە وانەی ئایینمان نەبوایە، بریا هیچ گوێم لە تۆ نەگرتایە و لێت نەگەیشتمایە. شەڵڵا منیش وەك هاوڕێکانم ئاگام لە دونیا نەبووایە و لەو جۆرە کەسانە بوومایە کە بەس بەو ڕۆژە دەزانن کە هان تیایدا. ئاخ چی دەبوو، گەر وا بوایە؟

هەندێك جار دەڵێم، با لەبری ئەوەی بەدەست ئەو جۆرە هەستانەوە بتلێمەوە، با وەك هەر کەسێکی تر بم و لەگەڵ دەوروبەرەکەم و هاوڕێکانم خۆم بگونجێنم. بەڵام تۆ دێیت و لەپێشم دادەچەقیت و دەڵێیت: "نا، نابێ ئەسەنگوڵ. ئەوەندە خۆت ڕاگرت، ئێستا دەتەوێ وا بکەیت؟" بەلام دەڵێم: "هێشتا کاتێکی زۆرم لەبەردەمدا ماوە، تا کەی هەر وا بم؟" تۆش دەڵێیت: "نەخێر! ڕابردوو ڕابورد، ئایندەش هێشتا نەهاتووە. هێشتا کات لەدەستمان

ماوه و دیار نییه کەی دەبڕێتەوە. کات دەبڕێتەوە، ئەوە نییە چەمێکی بێکۆتا بێت و، هەر بڕوا و نەبڕێتەوە. ڕۆژێك و لە کاتێکی هیچ چاوەڕوان نەکراودا ڕەنگە بۆ من، بۆ تۆ کۆتایی پێبێت..."

ئەگەر بهاتایەو تۆ ئەمانەت بە دەمی بە خەندەوە نەوتایە، هەر بیرێکم لەوە دەکردەوە ڕووبەڕووت ببمەوە و بەرگری بکەم. بەڵام چی بکەم لەو لێوە بەخەندەیەت؟... ئەریێ تۆ قەت تووڕە نابیت؟ ئەی خودایە! بریا ئەو ڕووەت گیری بخواردایە و تووڕە ببوویتایە، تا منیش بمتوانیایە لێت تووڕە ببم و هاوارم بکردایەتە سەرت و لە خەیاڵی خۆم دەرم کردبای. بەڵام کوا؟

شەوی ڕابردوو وتم: ئەگەر ئەم جارە بە خەندەکانییەوە هاتە پێشم، ڕووبەڕووی دەبمەوە و پێی دەڵێم: لا چۆ لەپێشم. تۆ بڵێی بتوانم وای پێبڵێم. گەلێك سوور بووم لەسەری، بەو خەیاڵەوە چوومە بن جێ و خەو بردمییەوە، جا کێ دەزانێت ئەمە سەعات چەندی دەمەوبەیان بوو؟

بەڵام دەرکەوت، دوای ئەو هەموو بیرکردنەوانە، لە خەونیشدا هەر گیرۆدەی داوی تۆ بووم. وەلێ من هەر سوور بووم لەسەر ڕووبەڕوو بوونەوەت و ڕەتکردنەوەی بیرەکانت. ئیتر خەندەکانت و نەرم و نیانییەکەت کارم تێناکات و لە ناخی خۆم دەرتدێنم. خۆ ئەگەر باڵەکانت بکەیتەوە بەسەرتدا تێدەپەڕم...

ئەو خەیاڵانەی لە بێداریدا هەمبوون، لە خەونەکانیشمدا درێـژەیان کێشا. بەڵام ئەوە چییە؟ ئای تۆ چەند زۆرزانیت؟ ئەم جارەیـان پـەنا بۆ شتێك دەبەیت کـە تـا ئێسـتا نـەتکردووە. ئـەوە یەکـەم جـارە بـە چاوی بەفرمێسکەوە دەتبینم و دەگریت:

"ئەسەنگوڵ، ئەسـەنگوڵ، کچـەکەم، جەرگەکـەم!" بـەدەم وتنـی ئەمانەوە، هەنسك لە قورگت گیر ببـوو. منـیش بەمـە ئـەژنۆم شـکا و کەوتمە ئەو ناوە. ئیدی نە هێزی ڕۆیشتن لـە ڕێـی گونـاه و نـە هێـزی بیرکردنەوەم ما. بەیانییەکەی کە بەهەنسکەوە خەبەرم بـووەوە، تـام لێهاتبوو... ئێستاش هەر وا لەناو جێ کەوتوومە و ئەم دێڕانەشت هەر لەناو جێوە بۆ دەنووسم.

بە هەر حاڵ، توانیم تا ڕادەیەك ئەوەت تێ بگەیـەنم کـە ئـەو کچـە پاکەت –ئەسەنگوڵ– چی لێهـاتووە یـان خەریکـە چـیی لێبێـت. ئـەو گۆڕانەی لە کەسانی تر چاوەڕوان بوویت، لـە منـت دی. بـەم جـۆرە، ئەو ئەسەنگوڵەی کە تا ئێستا دەتوت پێنج فەرزە دوعای بۆ دەکـەم، ئیتر دەپرسیت دەبێ شایانی ئەمە بێت؟ نازانم، خەم بۆ بەباداچوونی ئەو هەموو هەوڵ و ماندوو بوونەت دەخۆیت یان نا، بەڵام کەم تـا زۆر هەست بەوە دەکەم کە چەند دڵشکاو دەبیت. بەڵام تـو ئـەو خودایـە، مامۆستا گیان! دڵتەنگ مەبـە، یـان بڵـێم لـەوە زیـاتر دڵتـەنگ مەبـە، چونکە هیچی لێشێن نابێت.

ئایا ئێمە قوربانیی قەدەرین، یان ئەوەندە لاوازین لەبارماندا نییە درێژە بە چاکەکاری و پەرستشەکانمان بدەین؟ هەر چییەك بێت تـۆ لەمەدا تاوانت نییە. ئیتر تۆ واز لەبیرکردنـەوە لـەوە بێنـە، کـە داخـۆ ئەسەنگوڵ و هاوشێوەکانی تووشی بێئومێـدیت دەکـەن یـان نـا. خـۆ هەر لەبەر ئەوەشە ناخی خۆمم بۆ هەڵڕشتوویت و باسی حاڵی زارم بۆ کردوویت.

ماڵئاوا، مامۆستا گیان، ماڵئاوا...

ئەسەنگوڵ



# ئەو خووە زیان بەخشانەی هەڕەشە لە گەنجان دەکەن

## یادخەرەوەکانی ئەسرینێك

● ژنێکی خۆپەرست، گەلێك لەخۆی ڕازی بوو و بەردەوام گلەیی لە پیس و پۆخڵیی دراوسێکەی دەکرد، ڕۆژێك یەکێك لە هاوڕێ نزیکەکانی بردە لای جامی پەنجەرەکەیانەوە و وتی؛

"- سەیری ئەو جلانەی دراوسێکەمان بکە چەند پیسن!"

بەڵام هاوڕێکەی ناوا بەرپەرچی دایەوە؛

"- ئەگەر کەمێك وردتر سەرنج بدەیت، بۆت دەردەکەوێت ئەوەی پیسە جامەکەی تۆیە نەك جلەکانی ئەو."

قوتابییەکم کە دەوڵەمەند و بەخۆنازبوو، قوتابییەکی هەژار و لە هەمان کاتدا کەمئەندامی گریاندبوو. جا نازانم گاڵتەی لەگەڵ کردبوو یان هەر بەڕاستی ویستبووی ئازاری بدات. لەبەر دڵڕەنجاندنم بە بینینی فرمێسکەکانی ئەو قوتابییە، نەمتوانی تا دوایی قسەکانی گوێی لێبگرم. ئەو بابەتەم گۆڕی کە بڕیار بوو لە وانەی «خووڕەوشت»دا باسی بکەم، بەم جۆرە دەستم بە قسە کرد:

- بە چاوی سووك سەیری کەسانی تر مەکەن. چونکە ئەوانیش خودا بەدیهێناون. ئەو کەمئەندامی و کەموکوڕییەی بە کەمیی دەزانن، بە ویستی خۆیان نەبووە. نابێ بەهۆی شتێکەوە گاڵتە بە یەکێك بکرێت کە بە دەستی خۆی نییە.

هەمدیس، نابێت مرۆڤ بەهۆی ئەو جوانی و باڵایی و دەوڵەمەندییەی هەیەتی، بەخۆی بنازێت و خۆی پێباڵا بێت. دەبێت بزانێت ئەو دەوڵەمەندییەی هەیەتی لە باوکی یان لە دایکییەوەیە. جوانی بەخششی خودایە. جلی جوانیش، لە کارامەیی بەرگدروو یان کارگەی جلسازییەوەیە. ئەوە ناهەقییە شانازی بە شتێکەوە بکەیت و خۆتی پێ بابدەیت کە کار یان بەرهەمی تۆ نەبێت. هەموو جۆرە بەخۆ نازین و خۆ بەگەورە و باڵا زانینێك، خراپ و گوناهە. خۆ ئەگەر شانازی کردن و خۆ بەگەورە زانینەکە، بەهۆی شتێکەوە بێت کە هی خۆی نەبێت و لە ئازایەتیی خۆی نەبێت، مانای وایە دوو جۆرە گوناهی ئەنجام داوە.

ڕۆژێـك مـەلا مەشـهوور بـەڕێوە كـوڕە دەوڵەمەنـدێكی بـەخۆنازی كەوتـە بـەر چـاو... كـوڕە سـواری ئەسـپێكی پێشـبڕكێی زۆر جـوان بووبـوو، كـە بـە جلـەو و زینـی لـە زێـڕ و زیـو ڕازێنرابـووەوە... وەك شازادە شیكپۆش بوو و جلی زۆر جـوانی لەبـەردابوو. ڕۆبەكـەی سـەر شانی چاوانی شەوارە دەكرد. پارچە پەڕۆیەكی زۆر جوانی بریقەداری لە سەری ئاڵاندبوو و پەڕە تاوسێكیشی لەناودا چەقاندبوو.



خەڵكی لەمبەر و ئەوبـەری ڕێیەكـە بەحەپەسـانەوە لێیـان دەڕوانـی و بەغیلییان پێدەبرد... هەرچی مەلاشـە كە بە لایـدا تێپـەڕی، وەك ئـەوەی نـە بـای دیبـێ نـە بـاران، هـیچ خـۆی تێكنـەدا. ئەمـە سـەرنجی كـوڕە گەنجەكـەی ڕاكێشـا، ئەگەرچـی چـەند هەنگاوێكیش ڕەتی دابوو، ئەسـپەكەی بادایە دواوە و بانگی لێكرد:

– مەلافەندی! دەڵێی هەستت بە من نەكرد؟

مەلا هیچ خۆی تێكنەدا:

– ڕەنگە وا بووبێ.

گەنجەكە بەم وەڵامە تەواو شێتگیربوو و وتی:

– باشه چۆن هەست بە من ناکەیت؟ دە تۆ سەیرێکی جوانی و ڕەسەنیی ئەم ئەسپە بکە، ناودارترین ئەسپی ئەم شارەیە.

مەلاش بەتووڕەییەوە وتی:

– جا بە تۆ چی؟! با ئەسپەکە بەوە بنازێت.

– ئەی ئەم جلەو و زینە لە زێڕ و زیوانە...

– با ئەو وەستا دەستڕەنگینانە پێوەی بنازن کە دروستیان کردوون...

بەخۆنازینی گەنجەکە تەواو پێکرابوو. ئینجا ڕۆبە لە سورمە دروستکراوەکەی سەر شانیی پیٚ نیشاندا:

– باشە ئەی بەم ڕۆبە دەڵێیت چی؟

– چی دەڵێم؟! دەڵێم: با ئەو بەرگدرووەی دروستی کردووە، پێوەی بنازێت.

لاوە خوێن گەرمەکە خەریك بوو دەست بۆ پەڕە بریقەدارەکەی تاوسەکە ببات. مەلا بێئەوەی ڕێی پێبدا قسەکەی بکات، وەڵامەکەی پێوە لکاند:

– واز لەوەش بێنە، با تاوسەکە پێوەی بنازێت...

گەنجە بەخۆ نازەکە، ناچار بە داخ و کەسەرەوە ئاوزەنگی لێدا، ئەسپەکەی لێخوڕی و لێی دا ڕۆیی... مەلا مەشهووریش لەناو خۆشیی ئەوەی پەندێکی باشی داداوە، درێژەی بە ڕۆیشتنەکەی دا...

هەندێك لە گەنجانیش، وەك ئەم جوامێرە بەخۆ نازە، شانازی کردن بە بالآییەك کە لە ئازایی خۆیان نییە، پێیان ماریفەتە. ئەمە لە کاتێکدا کە ئەوە بەدرەفتاری و نەفامییەکی تەواوە. جگە لەوەی گوناهە و لە ئاکاری موسوڵمان ناوەشێتەوە.

## خۆپەرستی خووێکی زۆر قێزەونە

یەکێکی تر لە نەخۆشییەکانی گەنجان بانگ کردنی هاوڕێیانە بە ناوی ئاژەڵانەوە. ئەمەش گوناهە و خووێکە کە لە بیروباوەڕی ئێمەدا بە شێوەیەکی بنبڕ قەدەغە کراوە. چونکە مرۆڤ پایەدارترین ئافەریدەی خودایە، کەس بۆی نییە بە کەمی بزانێت و سووکایەتیی پێبکات.

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەوە دەدات کە مرۆڤی بە جوانترین شێوە هێناوەتە بوون. مرۆڤ، هەم لە ڕووی ماددی و هەمیش لە ڕووی مەعنەوییەوە زۆر جوان و کامڵە. بێزلێکردنەوە و بەسووك زانینی، بەسووك زانینی بەرهەم و جێدەستی خودایە. کەسی باوەڕدار چۆن کاری وا دەکات؟ دەکرێ وا بکات، بێئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کە ئەوەی دەیڵێت چ مانایەك هەڵدەگرێت. ئەگەر نا، ئەوەی لەوە بگات قسەکەی چ مانایەکی هەیە، گەرەکە دەمودەست دەستبەرداری ئەم خووە ببێت.

سەرباری ئەوەی مرۆڤ چۆن شتێك بە یەكێك دەڵێت كە حەز نەكات بە خۆی بوترێت؟ ئایا ئەمە خۆپەرستی و خۆ بەگەورە زانین نییە؟ ئەوەی بەردەوام بێت لەسەری، وای لێدێت لە كۆمەڵگە بێزراو بێت و حسێبی بۆ نەكرێت و وردە وردە بەرەو تەنهایی و بێیار و یاوەری بچێت، چونكە ئەوەی هەر تەنها خۆی بەدڵ بێت و تەنها خۆی خۆشبوێت، نە دەتوانێت خەڵكی تری خۆش بوێت و نەدەشتوانێت وەك پێویست ڕێزیان بگرێت. كێ دەتوانێت لەگەڵ كەسێكی وادا دۆستایەتی و هاوڕێیەتییەكی ڕاست و ڕەوان دابمەزرێنێت؟

پێغەمبەرمان (دروودی خودای لێبێت) فەرموودەیەكی جوانی هەیە. ئەم فەرموودەیە، هەموو ئاكارە جوانەكان دەگرێتەخۆ و بابەتەكەی ئێمە ڕوون دەكاتەوە. سەیر بكەن، پێغەمبەرە مەزنەكەمان (دروودی خودای لێبێت) چی دەفەرموێت:

**"موسوڵمانی ڕاستەقینە ئەو باشەیەی بۆ خۆی دەیەوێت، بۆ موسوڵمانانی دیكەش دەیەوێت. ئەو خراپەیەی بۆ خۆی نایخوازێت، بۆ غەیری خۆیشی نایخوازێت."**

ئەمە چ پێوەرێكی باڵای خووڕەوشتە؟ چەند پابەندی ئەم پێوەرە ببین ئەوەندە دەبینە موسوڵمانی چاك. چەندیش بەجێی نەهێنین ئەوا ئەوەندە خۆپەرستین. كە خۆپەرستییش خووێكی ئەوەندە قێزەونە، مەگەر خووێك هەیە لە وتنی: "خودای من! بەس بۆ من" و

خواستنی هەموو چاکەیەك بۆ خود و هەموو خراپەیەکیش بۆ کەسانی تر، زیاتر مرۆڤ بچووك و سادە بکاتەوە؟!

لە ڕاستیدا خۆپەرستی واتە بیرکردنەوە تەنها لە گەدە و کەیف و زەوقی خۆ، بە مرۆڤی کامڵ دانانی کەسانی وا، بەڕاستی زەحمەتە. چونکە ئەم خەسڵەتە تەنها لە ئاژەڵ دەوەشێتەوە. بۆ نموونە: ئایا قەت سەرنجتان داوەتە ئەو سەگانەی لە بەردەم قەسابخانەدا خۆیان مەڵاس دەدەن؟

لە بەردەم قەسابخانەکەدا بەناویەکدا دێن و دەچن... هەر ئەوەندە ببینن ئێسکێك فڕێ دەدرێت، بەردەبنە یەك و دەکەونە وێزەی گیانی یەکدی، تا بتوانن ئێسکەکە بۆ خۆیان بڕفێنن. یەکێکیان لەم ململانێیە سەردەکەوێت و ئێسکەکە دەڕفێنێت. کەمێك دوور دەکەوێتەوە و لە لایەکدا دادەکەسێت. ئێسکەکە دەخاتە نێوان هەر دوو لینگی و دەکەوێتە قەپاڵ لێگرتن و جاوینی.



● ئەو کەسانەی لە پێناوی بەرژەوەندیدا دەبێت بە دەماقاڵەیان و بە گژ یەکدا دەچن چ جیاوازییەکیان دەمێنێتەوە لەگەڵ ئەو سەگانەی بۆ پارچە ئێسکێك دەیکەن بە شەڕ؟ مرۆڤ دەبێ مرۆڤ بێت. دەبێ ئەوە بکات و بڵێت کە لە مرۆڤ دەوەشێتەوە.

ئەوانی تریش لیك بە دەمیانەوە شۆڕ دەبێتەوە و بەدەوریدا دێن و دەچن و تووڕە تووڕە لێی دەڕوانن. ئەو سەگەش کە ئێسکەکەی چنگ کەوتووە، بە ترس و دڵەڕاوکێوە دەمی لەسەر ئێسکەکە و چاویشی لەسەر سەگەکانی ترە. لەبەر ئەوەی بەترسەوە ئێسکەکە دەخوات، ئەوەی تام بێت لێی ناکات. چونکە ئەگەر بۆ چاوترووکانێك غافڵ بێت و ئاگای لە ئێسکەکە نەمێنێت، یەکێك لەو سەگانەی بە دەوریەوەن و سەرنجیان لەسەریەتی یەکسەر ئێسکەکە دەڕفێنێت و بۆی دەردەچێت. بەمەش دەبێتە ڕاکەڕاك و بەیەکدا هەڵپڕژان و یەکتر ڕاونانێك نەبێتەوە. لە جیاتی ئێسك دەست بە قەپ لە یەکگرتن و یەك خواردن دەکرێت. مرۆڤەکانیش بەهۆی وەڕس بوونیانەوە، دەکەونە بەر شەقدان و هەڵبڕینیان.

ئەمە خۆپەرستی و ململانێی بەرژەوەندییە لەنێو سەگاندا. ئەو مرۆڤەش کە وا بە دیاریانەوە، لەبری تووڕە بوون لە پێکەنین خۆی بۆ ناگیرێت. چونکە دەکرێ بوترێ ئەم بەیەك هەڵپڕژانە، لە ئاژەڵی بێ ئەقڵ و بێ ئابڕوو دەوەشێتەوە، واتە کارێکی سەگانەیە. بەڵام ئەگەر بێت و ببینین کەسێك یان کۆمەڵگەیەك بەم کارە هەڵدەستن، ڕەنگە بە هەمان شێوە پێنەکەنین. چونکە ئەمە دەبێت بە سەگ بوونی مرۆڤ و هەڵسانی بە کارێك کە هەر لە سەگ دەوەشێتەوە. هەر بۆیە بە هیچ جۆرێك کردەوەیەکی خوازراو نییە. مرۆڤ تەنها دەبێت مرۆڤ بێت. دەبێ تەنها ئەوە بکات و ئەوە بڵێت کە لە مرۆڤ دەوەشێتەوە.

ئەگەر نا، ئەو خودایەی ئێمەی بە مرۆڤی بەدیهێناوە، بەهۆی هەڵسوکەوت کردنمان وەك بوونەوەرێکی بێئاوەز، لێپێچینەوەمان لەگەڵدا دەکات. ژیانیش لەناو کۆمەڵگەیەکدا کە ئەم جۆرە مرۆڤانە تێیدا زیادیان کردبێت، زیاتر سزا دەگەیەنێت لە دونیادا.

## چۆن لە خۆپەرستی ڕزگارمان دەبێت؟

خۆی لە خۆیدا خۆپەرستی نەخۆشییە. نەخۆشییەکی ڕۆحییە کە جەستەش دەگرێتەوە... هەر بۆیە دەبێت لەگەڵ دەست پێکردنی نەخۆشییەکەدا، زوو دەستنیشان بکرێت و یەکسەر دەست بە چارەکردنی بکرێت.



– ئەمە چۆن دەکرێت؟

محەمەدی فەیلەسووف پرسیارەکەی کرد، وەلێ تێکڕای پۆلەکە گوێ قوڵاخ بوون. تەنانەت هەندێکیان ئەوەشیان دەردەبڕی کە پرسیارەکەی کاکە محەمەد بێجابییە.

– هەڵبەتە زانینی چۆنیەتیی هاتنە ئاراشی گرنگە... ئێستا ئەوەتان بۆ ڕوون دەکەمەوە.

- بەڵێ، ئازیزەکانم! ئەم نەخۆشییە کە خۆپەرستیی پێدەوترێت، چۆن دەستنیشان دەکرێت؟ چۆن لە مرۆڤدا دەست پێدەکات؟

خۆی ئەم نەخۆشییە بە شێوەیەکی گشتی لەم تەمەنانەی ئێوەوە دەست پێدەکات، واتە لە تەمەنێکی زۆر زوودا. بەم شێوەیە لە دەست پێکردنی دەگەین:

ئەگەر حەزتان نەکرد ئەوەی هەتانە بەشی خەڵکی تریشی لێبدەن، ئەگەریش کەوتنە حاڵەتی ناچاریی بەش پێ دانیشەوە، لە ناخەوە هەستتان بە دڵتەنگی کرد، ئاگادار بن، ئەوا نیشانە سەرەتاییەکانی نەخۆشییەکە لێتان بەدەرکەوتووە. بۆ نموونە: دوێنێ لە یەکێك لە پۆلەکاندا ڕووبەڕووی ڕووداوێکی وا بوومەوە:

هاوڕێیەکتان کاغەزی لەگەڵ خۆیدا نەهێنابوو بۆ تاقیکردنەوە کە بێگومان ئەمەش کارێکی ناباشە، داوای کاغەزی لە هاوڕێکەی سەر هەمان (ڕەحلە) کرد. ئەویش پێی وت کە هی زیادەی پێنییە. من کە گوێبیستی ئەو قسانە بووم، بە قوتابییەکانم ڕاگەیاند. چەند قوتابییەك هەر وەك ئەوەی لە پێشبڕکێدا بن، کاغەزیان بۆ درێژ کرد. ڕێك لە ناوەڕاستی کاتی تاقیکردنەوەکەدا، یەکێك لە قوتابییەکان ئەو لیڤێکسەی لەسەری دەنووسی کەوتە سەر ئەرز و دە پانزە کاغەزی لێدەرچوو و بەو ناوەدا بڵاو بووەوە. دەزانن ئەو قوتابییە کێ بوو؟

ڕێك ئەو قوتابییە بوو کە کەمێك لەوەو پێش وتی: "کاغەزم پێ نییە". لەنێو ڕوانینە پڕ لە سەرسوڕمان و حەپەسانەکانی

هاوپۆلـەکانی کاغـەزە پـەرش و بڵاوەکـانی پێکۆنەدەکرایـەوە و بـە دەستەسـڕەکەی ئارەقـەی ناوچـەوانی دەسـڕییەوە، ئارەقـەی وەك ڕووبار لێدەچۆڕا ... ئـەو قوتابییـەی لـە تەنیشـتییەوە بـوو و کـەمێك لەوە پێش پێی وت کاغەزی زیادەم پێنییە، لە جێی خۆی هەڵسایەوە و سووڕایەوە لای ئەو، کاغەزەکانی سەر ئەرزەکەی بۆ کـۆ کـردەوە و خستییەوە نـاو لیڤێکسـەکەی. کـە لیڤێکسـەکەی بـۆ درێـژ کـرد، ئـەو قوتابییە کە چاوانی تەڕ و گۆناکانی سوور سوور هەڵگەڕابوون، ڕاسـت دایە پڕمەی گریان. کە هەڵسـایەوە سـەر پـێ دەمزانـی دەیـەوێ چـی بڵێت. ڕێم دا، بچێتە دەرەوە و دوای کەمێك بە دەموچاو شـۆراوییەوە گەڕایەوە.

دوا جار لەو تاقیکردنەوەیەدا، نمرەیەکی زۆر کـەمی هـاورد. بـەڵام لەلای من نمرەیەکی زۆر بەرزی ڕەوشتی بەدەست هێنا. چـونکە دوای تەواو بوونی وانەکە، دەستی لە ملـی ئـەو هاوڕێیـەی کـە کاغەزەکـەی پێنەدابوو کردبوو و، بە هەنسکەوە داوای لێبـوردن و گـەردن ئـازادیی لێدەکرد. قوتابییەکەی تریش زۆر پیاوانە، بـەدەم وتنـی: "چ حـەددم هەیە، بەڵام ئەگەر هەقێکم لەسەرت هـەبێت، گـەردنت خـۆش و ئـازاد بێـت. تـۆی مەسـەلەکە گـەورە دەکـەیت، چـی ڕووی داوە؟"، هـەوڵی دڵنەوایی دەدا.

نیشانەیەکی خۆپەرستی، ئا بەم جـۆرە هـەر لەگـەڵ دەرکەوتنیـدا کۆتـایی پێهێنرابـوو. چـونکە ئـەو هاوڕێیـەمان ئـەم نەخۆشـییەی بـە

کاریگـەرترین دەرمـان -کـە فرمێسـکی چـاوانە- سـاڕێژ کردبـوو. کاریگەرترین قڕکەری خووە خراپـەکان فرمێسکە. ئەمـە قـەت لـەبیر مەکەن...

ئەوانەش کە بە سەرکەوتنی خـەڵکی دڵتـەنگ دەبن و بـە دڵتـەنگ بوونیشـیان دڵخـۆش دەبـن، دەبـێ ئاگـادار بـن. چـونکە ئەمــەش نیشانەیەکی خۆپەرستییە. موسوڵمانان بـرای ئـایینیی یـەکترن. هـەر لەم سۆنگەیەوە موسوڵمان بەشدار دەبێت لە خۆشیی و ناخۆشیی برا و خوشکە ئایینییەکانی. دەبێت خۆمـان لەسـەر ئەمـە ڕابهێـنین. ئـەم هەڵسوکەوتە، پێکوتە (لوقاح)ی نەخۆشیی خۆپەرستییە.

بۆ نموونە: با بڵێین هاوڕێیەکتان لـە بیرکـاری (دە)ی وەرگرتـووە. ئایا دەچیتە لای و پیرۆزبایی لێدەکەیت؟ لـە خۆشـییەکەیدا بەشـدار دەبیـت؟ یـان دێیـت و دەڵێیـت: "بـە چـی دەی هێنـاوە؟ خۆزگـە ئەوەندەی نەهێنایە!" ئەگەر وا بوو، ئەوا نەخۆشـیی خۆپەرسـتی لـە تۆدا سەری هەڵداوە.

ئەگەر لە کاتی دەرنەچوونی هاوڕێیەکتـدا بـە قسـەی خـۆش دڵـی بدەیتـەوە، یـان ئەگـەر خـۆت لـەو وانەیـە بـاش بیـت و دەرسـی پـێ بڵێیتـەوە، کـارێکی زۆر بـاش دەکـەیت... نەخۆشـیی خۆپەرسـتی ناتوانێت توخنت بکەوێت.

بێگومان نابێت ئەم هەڵسوکەوتانە تەنها لە پۆل و قوتابخانەدا ئەنجام بدرێن، بەڵکو دەبێت لە ماڵ و کووچە و کۆڵان و هەموو شوێنێکدا ئەنجام بدرێن.

وەك چۆن لە قوتابخانەدا ئەگەر هاوڕێیەکتان نەیتوانی خواردن بکڕێت تۆ بەشی دەدەیت، دەبێت لە ڕێشدا عەلاگە بۆ تەمەنداران هەڵبگریت، لە ماڵیشدا دەرس بە خوشك و برای بچووکت بڵێیتەوە و یارمەتیی دایك و باوکت بدەیت. خۆپەرستی هەرگیز خۆشیی لەمانە نایات، چونکە ناتوانێت لەلای کەسێك خۆی پەنا بدات کە هەڵگری ئەم خەسڵەتانە بێت.

## بەکر ئەفەندیی خۆپەرست

ئێستا چیرۆکی خۆپەرستییەکی تولانیتان بۆ دەگێڕمەوە. ئینجا بۆتان ڕوون دەبێتەوە کە نەخۆشیی خۆپەرستی، ئەگەر هەر لەگەڵ سەرهەڵدانیدا، ڕێوشوێنی پێویستی لە دژ نەگیرێتە بەر و ڕێگریی لێنەکرێت، چی لێدەکەوێتەوە و چۆن مرۆڤ دەستخەرۆ دەکات؟ چۆن دەبێت بە نەخۆشییەکی درێژخایەن و مرۆڤ بچووك دەکاتەوە و تەنانەت دەیکات بە گاڵتەجاڕیش. ئایا ڕێی تێدەچێت کەسێکی خۆپەرستی وا، لای خەڵکی خۆشەویست و ڕێز لێگیراو بێت؟

بەڵێ، با بێینە سەر چیرۆکەکەمان. بەڵام ئەمە، وە نەبێت هەر چیرۆکێك بێت و ڕووی نەدابێت:

لــه دەورانــی فــەرمانڕەواییی (ســوڵتان مــەحموود)دا، لــە شــاری ئەستەنبووڵدا پیاوێك هەبووە... ئەم پیاوە زۆر خۆپەرست و ئێرەیی بەر بووە و هەر بیری لای خۆی بووە، لەم ڕووەوە ناوی دەرکـردووە. کە وتراوە «بەکر ئەفەندیی خۆپەرست»، کەسێك نـەبووە نەیناسێت. واتە تا مەزەندە دەکرێت خۆپەرست...

هــەر کاتێــك باســی خــۆ پەرســتی کرابێــت، خــەڵکی ئــەویان بیرکەوتووەتەوە و وتوویانە: "وەك بەکر ئەفەندیی خۆپەرستە"...

ئــەم نـاو و ناوبانگـەی ڕۆییـوە ڕۆییـوە تـا گەیشـتووەتە سـوڵتان مـەحموود. سـوڵتان مـەراق گرتوویـەتی و داوای کـردووە ئـەو پیـاوە ببینێ کە ناوبانگی بە خۆپەرست ڕۆیشتووە.

خەبەر دراوەتە بەکر ئەفەندی کە سوڵتان دەچێتە لای. بێگومـان ئەویش گـەلێك بـەو هەواڵـە دڵخـۆش بـووە و ئەوەنـدەی پێـی کـراوە، ئامادەکاریی کردووە. سوڵتان تەشریفی هێناوە... هەم هەڵسوکەوتی بــەکر ئەفەنــدی و هــەمیش ئامادەکارییــەکانی بــە دڵ بــووە. دانیشتنەکەیان خۆش بووە و کاتی هەڵسان و ڕۆیشتنی سوڵتان نزیـك بووەتەوە. بەڵام ئەو هەر بیری لای ئەوە بووە کـە بـۆ ئـەم پیاوەیـان ناو ناوە خۆپەرست، لە کاتێکدا ئـەو ئەوەنـدە پیـاوێکی باشـە... شـا ویستوویەتی تاقیی بکاتەوە، وەك ئەوەی باوە، وتوویەتی:

– بەکر ئەفەندی! دەستەکانت خۆش بێت، بەڕاستی کەوتیتە بـەر دڵم... ئێستا داوای چیم لێدەکـەیت، بیکـە... تـەلار، پـارە، ئەسـپ،

ئۆتۆمبێل؟... چیت بویٚ، بۆتی دەکەم. بەڵام بە مەرجێك: ئەوەی دەتەویٚ دەتدەمیٚ، وەلیٚ دوو قاتی ئەوە دەدەم بەو دراوسێیەی تەنیشت ماڵت.

بەکر ئەفەندی لەناو خۆشییەکی تاڵدا کەوتووەتە بیرکردنەوە، خۆی هێناوە و بردووە، نەیتوانیوە خۆی لە خووە خۆپەرستییەکەی لابدات. بەو ئومێدەی دراوسێکەی تووشی زیانی زیاتر ببێت، قایل بووە بەوەی گۆبەندێك بۆ خۆی بنێتەوە و وتوویەتی:

– گەورەم! چاوێکم دەربێنە!...

بەم شێوەیە، لە پێناوی دەرهێنرانی هەر دوو چاوی دراوسێکەیدا، بە دەرهێنرانی چاوێکی خۆی ڕازی بووە. ئا بەم جۆرە خۆپەرستی، بۆی هەیە ئەو قسمەتانەی تا بن دەست دێن، لە دەست دەربێنێت. چونکە خۆپەرستیی ئاوا درێژخایەن، لەگەڵ خۆیدا پەنای ئێرەیی و بێشەرمی و ڕق و قین و بێڕێزیش دەدات. بۆ ئەوەی نەکەوینە داوی ئەم خووە بەدەوە، وا پێویست دەکات لە ڕێی باوەڕەوە هەستە جوانەکانی وەك ڕێز و خۆشەویستی و برایەتی و قوربانیدان لە ناخماندا بڕوێنین. ئەگەر نا، پەنا بە خودا، بەکر ئەفەندیی نویٚ لەناو ئێوەشدا هەڵدەکەوێت...

## ئاژەڵان سکاڵاکەر بوونایە...

نیشانەیەکی دیکەی خۆپەرستی ئاوایە: هەندێك کەس کەسانی بەرانبەریان بە ناوی ئاژەڵ بانگ دەکەن. ئەمە هەم سووکایەتییە بە بەرانبەرەکە، هەمیش سووکایەتییە بە ئاژەڵەکە.

ئەگەر بە مرۆڤێکی باش بوترێت ئاژەڵ، ئەوە تاوانە، تۆمەتبار کردنە، سووکایەتییە و بگرە بوختان پێکردنە. هەر کامێکیان بێت، بەپێی ئاکاری ئیسلامی بە قەدەغەکراو و حەرام دێتە ئەژمار.



● هەندێك کەس بە ناوی ئاژەڵ بانگ لە بەرانبەرەکانیان دەکەن. ئەمە هەم نیشانەی بە سووك و کەم زانینی بەرانبەرەکەیە و هەمیش مانای سووکایەتی بە ئاژەڵەکە لە خۆ دەگرێت...

خۆ ئەگەر واش نەبێت و ئەو کەسەی بە ئاژەڵ بانگ کراوە بەڕاستی کەسێکی خراپ بێت، ئەوە دیسانەوە کارێکی ئاسایی نییە. چونکە ئەم جارەیان سووکایەتی بە ئاژەڵەکە کردووە. شوبهاندنی ئاژەڵێك -کە بە گۆشت و شیر و خوێن و ئێسك و بازووی لە خزمەتی مرۆڤایەتیدایە- بە کەسێکی خراپ و زیان بەخش کارێکی ڕاست نییە.

لەم سۆنگەیەوە، کاتێك بـە کەسێکی خـراپ و زیـان بـەخش دەڵـێین: "کەر"، "گا" یان "مانگا"، ئەوا مـافی ئـەم ئاژەڵانـەمان خـواردووە. ئەگەر ئاژەڵێکی وا سکاڵامان لەسەر تۆمار بکـات و بڵێـت: "خودایـە! ئەم پیاوە ناوی منی لـە پیـاوێکی خـراپ نـا. لـە کاتێکدا کـە مـن بـە گـوێرەی ئـەو مەبەسـتەی بـۆی هاتبوومـە بـوون، هەرچـییەکم لـێ چاوەڕوان کرابێت کردوومە. کەچی ئەو خەڵکەی کە من گۆشت و شیر و خوێن و ئێسکی خۆم پێبەخشین، ناوی منیان لە پیاو خراپان دەنا. سکاڵام لێیان هەیە."، هەقییەتی، وا نییە؟



# حاڵە پڕپەندەکانی

## ئەوانەی باوەڕی خۆیان لەدەست داوە

### ڕووداوێك کە بە ڕامانمان دێنێت

ئەم ڕووداوە کە یەکێك لەو مامۆستایانەی ڕێزی زۆری هەیە لام بۆی باس کردم، زۆر هەستی بزواندم. ئەم ڕووداوە هەر بەڕاستی هی ئەوەیە هەموو کەسێك لە ئاستیدا بکەوێتە ڕامان و هەست بزوان. سەرباری ئەوەی کە ئەمە تاکە ڕووداوێك نییە، بەڵکو یەکێکە لەو گەلە ڕووداوە هاوچەشنانەی کە گشتمان ڕووبەڕوویان بووینەتەوە یان گوێبیستیان بووین. ئەو مامۆستایە دەیگێڕایەوە:

"دوێنێ کچە گەنجێك هاتە ژوورەکەم... نێوچاوانی دابووە یەك، دیار بوو لە قەیران و ئازاردا بوو... باسی ئەوەی کرد کە بە ئاواتی ئەوەیە بە بینینی من بگات بە دەرەتانێك. ئەو خانمە ئەندازیار بوو و ماوەیەك لە ئەورووپا بووە، لەوێ ئیشی کردووە و ئیشیشی باش بووە. وتی:

– لە ئەورووپا هەستم بە بۆشاییی ئایین و ئیمان لە ناخمدا کرد. چی بکەم دایك و باوکم ئەڤینی ئیمان و ئیسلامیان لە ناخمدا نەڕواندبوو. من لای خۆمەوە پەیمان دەدەم ئەو ئەڤینە لە ناخی جگەرگۆشەکانمدا بڕوێنم...

لێم پرسی کە بۆچی ئاوا هەست بە خەم و ئازار دەکات. وتی:

– لە ئەورووپا قەشەیەك – کە پیاوێکی ڕووناکبیر بوو– بە فەزیلەت و توانای ئیقناعی تووشی سەرسوڕمانی کردم. زۆری نەمابوو لەسەر دەستی ببم بە دیان. زۆر بەخێرایی باوەشم بە قورئاندا کردەوە.

توخوا مامۆستا گیان! بۆ دایك و باوکانی ڕوون بکەنەوە و تکاش لە حکوومەتی خۆمان بکەن، نەهێڵن منداڵانمان بێ دین و دوور لە پەرستشەکان بن. لە ئەورووپا بۆم ڕوون بووەوە، کە بۆشایی ئیمان چ کارەساتێکە.

ئەو مامۆستایەی گوێی لەمە بووبوو، خۆی پێنەدەگیرا لەوەی هاوار نەکات:

"ئـەی ئەوانـەی تـەڵقینی دونیـای بـاوەڕ دەدەن بـە نـەفامی و ساویلکەیی و بێباوەڕی! ئەو بەدبەخت و بێچارە بوونە ڕۆژانەیەی ئەو هەزاران کچ و نەوجەوانـەمان و ون بـوون و لەدەست چوونەیان لـە مەرگەساتەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا جگەرتان ناسووتێنێت؟"

***



بێگومـــان بـــەم جـــۆرە ڕووداوانــــــە دەروونـــــە باوەڕدارەکـان دەتـەزن و خـەم دایاندەگرێت. دەمـەوێت باسـی کەسانێکی ترتان بۆ بکـەم کـە لــە لایــەکی تــرەوە دەســت وەردەدەن و بـــە دەوری ئـــەو ڕۆڵانەمانــدا دێــن کــە خۆمــان بێباوەڕمان کردوون. ئـەمڕۆ لـە سـەرتاپای جیهانـدا ڕێکخسـتنی جۆراوجـۆر هـەن بـۆ بڵاوکردنـەوەی مەسـیحییەت. بەمانـە دەوترێـت ڕێکخسـتنەکانی «مـژدەدەری – التبشـیر»". ئەمانــە لــە ئـەفریقا تەنانــەت سـەر دەکەنـە ئـەو دارستانانەشـەوە کـە تـا ئێسـتا تـەوریش نەچووەتە ناویانـەوە. لـەم نێوەنـدەدا دێنـە وڵاتـانی موسـوڵمان نشینیشـەوە. یـەکێك لـەو

مژدەدەرانەی بە ماڵاندا گەڕاوە و خەریکی بڵاوکردنەوەی نامیلکەی بانگەشەکاری بووە و لەو میانەیەدا گێراوە، ئەو قسانەی کردوونی زۆر پەند بەخشن. بۆ ئێمە گەلێك بەسۆ و بەقەد ئەوەش پڕپەند و ئامۆژگارین...

ئەم مژدەدەرە کە لە هەوڵدا بووە بۆ بڵاوکردنەوەی مەسیحییەت، دەڵێت:

– "مەبەستی من دوژمنایەتی کردنی ئیسلام نییە. دەمبینی زۆرێك لە موسوڵمانان هیچێك لە ئایینەکەیان نازانن و هیچ فەرزێك بەجێ ناهێنن. بە موسوڵمان دەچن، بەڵام نەك هەر فەرزەکانی ئیسلام بەجێ ناهێنن، بەڵکو خۆیان لە حەرامەکانیش بەدوور ناگرن. بگرە ئەوەی دینەکەیان لێی قەدەغە کردوون، بەشانازییەوە دەیکەن و چێژ لە گێڕانەوەی وەردەگرن. بەڵکو هەندێك جار دەیخەنە سەر کاغەزیش...

بیرم کردەوە، موسوڵمانان لە موسوڵمانێتی دوور کەوتوونەتەوە، ناشیانەوێت فێری ببن و پێوەی بژین. وتم با لەبری ئەوەی بە بێ دینی و بێ پەرستش بژین، با هەر هیچ نەبێت ببن بە دیان. سا بەهۆی دیانییەوە هەندێك گەرموگوڕ ببنەوە، چونکە من پێم وایە کەس بە بێ باوەڕی و بێ پەرستش ناتوانێت ژیانێکی ئاسایی بگوزەرێنێت."

چەند هەق بەو مـوژدەدەرە دەدەیـن و قسـەکانیمان چەند پێ ڕاستە؟ بەڕاستی جێی تێڕامانە، وا نییە؟ ئەوەش ڕاستییەکە کە ئەو جۆرە موسوڵمانەی ئەو باسی دەکات لە وڵاتەکەماندا بوونیـان هەیـە. باشـە لـە بەرانبـەر ئـەم بارودۆخـەدا، ئـەو ئەرکانـەی دەکەونـە سـەر شانمان، چین؟

گشـت قوتابییـەکانم دوای بیسـتنی ئـەم قسـانە گفتیـان دا هـەوڵ بدەن بەتەواوی خۆیان فێری بـاوەڕ و پەرستشـەکان بکـەن و ئـەوەی لەسـەریان پێویسـت بێـت بیکـەن. وەك بڵێـی یـەکێکیان تیـا نـەمابوو



تـەزوو بـە گیانیـدا نـەهاتبێت. بەشـێکیان لـە قەشـە و موبەشـیرەکان قینیان هەڵسابوو. بەڵام بەشێکی تریـان پێیـان وا بـوو کـە ئـەوان بـۆ بڵاوکردنەوەی ئەو ئاینە چەوتەی خۆیان تا ئێرە دێـن، ئـەی بـۆ ئێمـە هیچ ناکەین بۆ ئاینەکەی خۆمان؟

لە کۆتاییدا لەسەر ئەوە هاوڕابووین کە: باشترین وەڵام بۆ ئەو جۆرە ڕووداوانە، ئەوەیە کە ئێمە بەتەواوی لە ئاینەکەمان بگەین و پابەندی ببین. ئەگەر گشت موسوڵمانێك ئاوا زانا و دامەزراو بێت، بانگەشەی مژدەدەران بێ ئەنجام دەبێت.

## بەهای مرۆڤ چەندە؟



بەپێی توێژینەوەکانی کیمیاگەرێك، نرخی مرۆڤێك ٤٠-٥٠ هەزار دینارێك تێپەڕ ناکات. چونکە جەستەی ئێمە لەمانە پێکهاتووە: بایی دروست کردنی ٧ سەلکە سابوون چەوری، بەقەد بزمارێکی مامناوەندی ئاسن، ڕێژەیەك لە شەکر کە فنجانە قاوەیەك پڕ دەکات، گەچ بایی سواق دانی چەند مریشکێك ، فسفۆڕ بایی دروست کردنی دوو هەزار تەڵە شقارتە، پۆتاسیۆمیش بایی دروست کردنی باروت بۆ تێکرتنی گوللە تۆپێکی بچووك.

ئەو مرۆڤەی کە لە ڕووی ماددییەوە ئاوا بەهای کەمە، بەڵام خۆی بە هەموو دونیا نادات، پێویستە بیر بکاتەوە.

هەر خاوەن ئاوەزێك، کە نەیەوێت نرخی ڕاستینەی خۆی لە ئەڵماسەوە بۆ خەڵووز دابگرێت، دەبێت لە ئامانجی نێررانی بۆ سەر دونیا ورد ببێتەوە.

بەڵێ، ئەو زاتەی دەیان هەزار هەستی ناسکی بە مرۆڤ داوە و ئەوی لە دەرۆزەکەریی گەردوونەوە کردووە بە سوڵتانی سەرجەمی مەخلووقات، بێ هیچ گومانێك داواکاریی زۆر زیاتری لێی هەیە.

لە گۆڤاری (زەفەر)ەوە

مرۆڤە بێباوەڕەکان ئەگەر باشترین ئاین نەدۆزنەوە، ڕوو دەکەنە ئەوانەی کە کەمتر باشن. کەواتە سەرەکیترین ئەرکی سەر شانمان

ئەوەیە بە باشترین شێوە تەمسیلی ئەو باشترین و جوانترین ئاینە بکەین. ئەوسا دیانەکانیش لە ڕێی ژیانی ئێمەوە ئەو کامڵترین و بەرزترین ئاینە دەبینن و ڕەنگە ئەمە ببێتە هۆی ڕزگار بوونی ئەوانیش.

***

محەمەدی فەیلەسووف، دوای مۆڵەت وەرگرتن، وتی:

– مامۆستا ! با هەر بە قسە نەبێت... با ئێستا خۆمان فێری بناغەی ئاینەکەمان بکەین و هەر لە ئێستاشەوە بکەوینە پابەندی کردنی. ئێستا لە قەشە و موبەشیران قەڵس و زویر بووین و بڕیارێکیشمان لەم بارەیەوە دا. با هاوڕێیان سبەی لەبیری نەکەن.

– بێگومان، نابێت بڕیارەکەمان هەر بە قسە بێت. خۆ ئێمە لەبەر ئەوەی موسوڵمانین، لە مێژە بەوە دادەنرێین کە پابەندی لە ئاینەکەمان دەکەین. بەڵام لەبەر ئەوەی ئێستا بڕیارێکی تایبەتمان دا، دەبێت لە ئێستاوە بکەوینە بەجێ گەیاندنی.

مادام ئەو بڕیارەمان داوە، سەرەتا دەبێت لە نوێژەوە دەست پێبکەین. چونکە نوێژ لە لایەکەوە لە پایەکانی ئیسلامە و لە لایەکی تریشەوە ڕۆژی پێنج جارە، پەرستشێکی ڕۆژانەیە.

لەم بەینەدا، قوتابییەك بە دەنگێك کە دەبیسترا و نەدەبیسترا، وتی:

– لە هەموشیان زەحمەتترە.

وتم:

– دواتر دێینە سەر باسی ئەوەی زەحمەتە یان ئاسان...

تـا وانـەی داهـاتوو، هـەمووتان ئـەوەی پێشـتر دەربـارەی نوێـژ زانیوتانـە بـەبیر خۆتـانی بێننـەوە و شـەنوکەوی بکـەن، جێبـەجێی بکـەن، لـە کتێبەکانـدا بیخوێننـەوە، کـێ لـە ماڵـەوە دەیزانێـت لێـی بپرسن، بچنە مزگەوت و نوێـژەکانتان بەکۆمـەڵ بکـەن... تـا بتـوانین ڕوونی بکەینەوە بۆچی نوێژ دەکەین و سوودەکانی چین...

هێشتا وانەکە تەواو نەبووبوو، لە بەینی خۆیاندا کەوتبوونە باسـی ئەوەی کێ، چۆن، لـە کوێ، چـی بکـات؟ هەندێکیشـیان کەوتبوونـە بڕیاردان لەوەی پێکەوە بچنە کام مزگەوتە.



# ڕۆحیشمان پێویستیی بە خۆراکە

## پڕماناترین بەندایەتی

ئایا مرۆڤ لەسەریەتی بەندایەتیی خودا بکات؟ ئایا ئاوەزمان پێویستیی بونیادی مەعنەویمان – واتە ڕۆحمان– بە خواردن بەبیر ناهێنێتەوە؟ ئەگەر ئێمە تەنها خاوەنی بونیادی ماددی بووینایە، تەنها لە گۆشت و ئێسقان پێکهاتبایین، ئەوە پێویستییەکانیشمان هەر لە بوارە مادییەکاندا قەتیس دەمان. کەچی وەك چۆن گەدەمان پێویستیی بە نان و ئاوە، ئاواش ڕۆحمان پێویستیی بە خۆراکی مەعنەویی هەیە. ئەو خۆراکە مەعنەوییانە چین؟

یەكـــەم و ســــەرەكیترین وەڵامـــی ئـــەم پرســـیارە بـــاوەڕ و پەرستشـــەكانە. چـــونكە ئـــەوەی وا دەكـــات باوەڕمـــان هەمیشـــە تەندروست بێت پەرستشە. هەر پەرستشـێك كە بۆ خـودای دەكـەین خـاوەن كاریگەرییـەكی وایـە كـە باوەڕمـان دەپارێزێـت و بـەهێزی دەكات.

ئەگەر بێین و بە چاوێكی ماددەگەرانەوە بڵێین: "مرۆڤ تـەنها لـەو جەستەیە پێكدێت كە وا لەبەر چاومان"، ئەوا خۆمـان سـاكار نیشـان داوە. ئەمـە لـە كاتێكدا كـە مـرۆڤ ئافەریدەیـەكی سـاكار و وەك هـەر گیانلەبـــەرێكی تـــر نییـــە. بـــاڵاترین ئافەریـــدەی خودایـــە. ئـــەو ماددەگەرانەی نكوڵی لە ڕۆح و مەعنەوییاتی مرۆڤ دەكەن و هەر بـە ئـاژەڵ پێناســەی دەكــەن. هەنــدێكیان دەڵــێن: "مــرۆڤ ئاژەڵێكــە پێدەكـەنێت" یـان دەڵـێن: "ئاژەڵێكـە بـیر دەكاتـەوە". وەك چـۆن هەندێكیان دەڵێن: "ئاژەڵێكـە ئـامێر و كەرەسـتە دروسـت دەكـات"، كەسی واشیان تێدا هەڵكەوتووە كە دەڵێت: "ئاژەڵێكی گۆیایە".

مانـای وایـە ئەگـەر نكـوڵی لـە بونیـادی مەعنـەویی واتـە ڕۆحـی بكرێت، ئەوە تـەنها بـە ڕووە ماددییەكـەی زۆر بـێ نـرخ دەردەچێت. هەر بەڕاستیش ئەگـەر بـێین و مـرۆڤ وەك مـەڕ و بـزن تـەنها لـە ڕووە ماددییەكەیـەوە هەڵبســەنگێنین، ئــەوا ئەوەنــدەی ئــەوانیش كڕیـاری نابێت. ئەوەتا وەحشییەكانی ئـەفریقا لـە كۆنـدا حـەزیان لـە گۆشـتی مرۆڤ كردووە و لە بەرانبەریشدا هیچیان نەداوە. لەم دوا دواییانەشـدا

کەسی وا هەبووە کە جەستەی مرۆڤی وەك ماددەی خاو بۆ دروست کردنی سابوون و پەین بەکارهێناوە. هەموو ئەمانە نیشانەی ئەوەن کە مرۆڤ پارەی مەڕ و بزن و مانگا ناکات.

مرۆڤ کە بە گۆشت و خوێن و ئێسکی ئەوەندە بێنرخە، بەڵام بە ڕۆح و دڵ و هەستە پەیوەستەکانیەوە زۆر بەنرخە و گیانەوەرێکی فرە بەرز و باڵایە. خودا ناردوویە بۆ سەر زەوی تا نوێنەرایەتیی خودی خۆی بکات. ئێ خۆ هۆی بەدیهێنرانی مەخلووقەکانی تریش هەر مرۆڤە، چونکە هەر هەموویان بۆ خزمەتی مرۆڤ بەدیهێنراون.

ئادەمزاد بەهۆی ئەو ژیرییەی خودای گەورە پێی داوە لە باریدایە ببێتە فەرمانڕەوای گشت سروشت و سوود لە هەموو گیانەوەرانی تر وەربگرێت. لەم سۆنگەیەوە، بەرپرسیارێتییەکی گەورە و گرنگی لەسەرشانە. ئەمە ئەرك و بەرپرسیارێتییەکە کە بەرزیی ژیریی خستوویەتییە سەرشانی. مرۆڤ تاکە گیانلەبەرێکە کە بەهۆی هەستەکانییەوە خودا دەناسێت و لێی تێدەگات و باوەڕی پێدەهێنێت. لەم ڕووەوە لە گیانلەبەرەکانی تر جیادەبێتەوە. ئەو پەرستشانەی کە بوونەوەرانی تر هەریەکە و بە حاڵی بەدیهێنرانی خۆی ئەنجامی دەدات، ئەم هەموویان بۆ خودا دەکات و وتەبێژی بەندایەتییە بە ناوی هەموویانەوە... مرۆڤ گیانەوەرێکە کە فێردەبێت و تێدەگات و قسە دەکات، پەرستشی ئەو گیانەوەرانەی کە ئەم تایبەتمەندییانەیان نییە بۆ کردگار نمایش دەکات. خۆ ئەگەر لە

بەرانبەر پەرستشی ئەو زیندەوەرە بێهەستانە پەرستشی مرۆڤ بە هەست و زانستەوە نەبوایە ناهاوسەنگییەك دەهاتە ئاراوە. واتە ئەگەر بەرد و باڵندە و درەختەکان بە زمانی حاڵی خۆیان پەرستشیان بکردایە، کەچی مرۆڤ وێڕای ئەو هەموو بەرزی و بەخشایشەی پێی دراوە بەمە هەڵنەسایە دەبوو بە شتێك کە ئەقڵ و مەنتیق پێیان ڕاڤە نەکرێت.

سەیر بکەن بزانن منداڵێکی پێنج شەشساڵەش، چۆن دەتوانێت ئەم ڕاستییە قووڵە شرۆڤە بکات:

(سەلیم)ی بچکۆلە لە باوکی دەپرسێت:

– باوکە! ئایا خودا ئێمەی بەدیهێناوە؟

– بەڵێ، کوڕەکەم!

– ئەی کار و بەرخۆڵەکان؟...

– ئەوانیش خودا بەدیی هێناون.

– بەردەکانیش هەر خودا بەدیهێناون؟

– بەڵێ ڕۆڵە! بەردەکانیش هەر خودا بەدیی هێناون.

سەلیمی بچکۆلە دوای ئەوەی بۆ ماوەیەك وەستا و بیری کردەوە، دیسان کەوتەوە پرسیار کردن:

– باشە بابە گیان! ئایا بەرد ئەوە دەزانێت کە خودا بەدیهێناوە؟

– نا نازانێت، چونکە ئەقڵی نییە.

– باشە، ئەی بەرخۆڵەکان دەیزانن؟

– ئەوەندەی من بیزانم، ئەوانیش نازانن، کوڕەکەم!

– بەڵام خۆ ئێمە دەزانین خودا بەدیهێناوین، وا نییە؟

– وایە، کوڕی خۆم! دەزانین خودا ئێمەی بەدیهێناوە.

سەلیم کە ئەم وەڵامەی لە باوکی وەرگرت، بەجۆشەوە تفی قوت دا و بەخەندەوە لە باوکی پرسی:

– دە وا بڵێ باوکە! کەواتە لەم دونیایەدا ئێمە تاکە گیانەوەرین کە بزانین خودا ئێمە و گیانەوەرەکانی تریشی بەدیهێناوە. هەر بۆیەش لە دار و بەرد و بەرخ و هەموو شتێك پایەدارترین.

باوکەش دەستخۆشیی لێکرد بۆ ئەم بۆچوونەی و ئاوای وت:

– بەڵێ کوڕی خۆم! مرۆڤ پایەدارترین گیانەوەرە خودا بەدیهێنابێت، بەڵام وەك هەر پایەدارییەك، ئەمەش هەندێك ئەرك و بەرپرسیارێتی دەخاتە سەر شانی کەسەکان. پێویستە مرۆڤ پارێزگاری لەو باڵاییەی خۆی بکات.

***

– بەڵێ، ئازیزەکانم! ئەم بیرکردنەوانە، کە لە تەمەنی سەلیمی بچکۆلە چاوەڕێ ناکرێت بەڕاستی جێی دەستخۆشییە. کێ ناڵێت ئێستا حەز ناکات لەگەڵ باوکی بچێت بۆ مزگەوت؟

ئێوەش زۆر شاهێدی ئەو منداڵانە بوونە کە هەر لە منداڵییەوە ئاوا شەیدای نوێژن... ئەو منداڵانەتان بینیوە کە لەگەڵ باوانیاندا بۆ نوێژ لە خەو هەڵدەستن و لەگەڵ گەورەکانیاندا دەچن بۆ مزگەوت... نوێژ



● لە هیندستاندا مانگاکان بە چاوی پیرۆز لێیان دەڕوانرێت. هەر بۆیە ئەگەر مانگایەك لەسەر شەقام بکەوێت کەس ناتوانێت هەڵیبسێنێت.

کە تەنانەت زارۆیانیش هۆگرین و کەیفیان پێی دێت مانای وایە پێویستییەکی بنەڕەتیی بەدیهاتنمانە. دڵ و ڕۆحمان هەر لە منداڵییەوە چێژ لەو خۆراکە وەردەگرن. چونکە خودای گەورە ئاوا ئێمەی بەدیهێناوە. مەجبووری باوەڕ هێنان و بەجێ گەیاندنی پێویستییەکانی باوەڕەکەمانین. لە جیهاندا کەسێك نییە بێباوەڕ یان پەرستشنەکەر بێت، تەنانەت ئەوانەش کە بانگەشەی ئەوە دەکەن باوەڕیان بە هیچ نییە، باوەڕیان بە شتێك هەر هەیە. مرۆڤ بۆی هەیە لە باوەڕی ڕاست بەدوور بێت، بەڵام ئەوسا دەگلێتە سەر باوەڕێکی

ناڕاست. بۆ نموونە: بڕوانن ئێستاش لە هیندستان کەسانێك هەن مانگا بە پیرۆز دەزانن و باوەڕی پێدەهێنن. ئەگەر مانگایەك لەسەر جەنجاڵترین شەقامدا لێی بکەوێت کەس زاتی ئەوە ناکات هەڵیبسێنێت. ئەوەی مانگایەك ناڕەحەت بکات سزای قورس وەردەگرێت.

دیسانەوە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا کەسانێك بەدی دەکرێن کە: شەیتان، ئاگر، خۆر یان کەسێك دەپەرستن، هەرچەندە ژمارەیان ئەوەندەیش زۆر نییە.

کەواتە وەك چۆن مرۆڤ لە حاڵێکدا نانی دەست نەکەوێت بۆ ئەوەی نەمرێت دەست بۆ خواردنی کەلاکیش دەبات، بە هەمان شێوە ئەوانەی کە باوەڕی ڕاستینە نادۆزنەوە باوەڕ بە شتی قۆشمەی وا دەهێنن کە ئەقڵ نایبڕێت. ئەوەش هەیە دونیا بچووك بووەتەوە. واتە خەڵکی بەهۆی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن و ئاسانکارییەکانی گواستنەوەوە هەر لە شوێنی خۆیانەوە هەموو زانیارییەکیان بەدەست دەگات. لەم کلاوڕۆژنەوەیەوە ئەوەی بەجیددی بەشوێن بیروباوەڕی ڕاستی –واتە ئیسلام–ەوە بێت دەیدۆزێتەوە. هەر بەڕاستیش ئەوەتا ڕۆژانە هەواڵی موسوڵمان بوونی چەندین کەسمان لە گشت لایەکی دونیاوە پێدەگات.

## پارە و دڵخۆشیی

لە گەشتێکمدا چاوم بە یەکێك کەوت بانگەشەی ئەوەی دەکرد باوەڕی بە هیچێ نییە.

لێیم پرسی:

– ئەریێ تۆ هەر بەڕاست بێباوەڕیت؟ باوەڕت بە هیچ شتێك نییە؟

کابرا وتی:

– ئەریێ، من باوەڕم بە هیچ شتێك نییە، بە هیچ شتێك... واز لە مەسەلەی باوەڕ بێنە. لەم دونیایەدا گرنگ ئەوەیە پارەت هەبێت. پارەت هەبێت، ماشێنت بەسەر کێواندا سەر دەکەوێت، نەتبێت لە ڕێی تەختاییشدا ناتوانی بڕۆیت. پارە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا دەشکێت من پێویستم بە پارەیە، پارە نەك باوەڕ!

ئەو داماوە خۆی پێ بێباوەڕ بوو، وەلێ باوەڕی بە پارە هەبوو زۆریشی باوەڕ پێبوو، وەك بڵێی ببوو بە بەندەی پارە.

ئەمە لە کاتێکدا کە بەردەوام هەزاران نموونە دەبینین و دەبیستین لەسەر ئەوەی کە پارە ناتوانێت مرۆڤ دڵخۆش بکات. ئەم وتەیە چەند جوان ئەو بابەتە ڕوون دەکاتەوە: "پارە دەتوانێت توێکڵی زۆر شت بدات، بەڵام ناتوانێت کاکڵەکەی بدات. بۆ نموونە: دەتوانێت خۆراك بدات، بەڵام ناتوانێت مەیل (ئیشتیها) بدات. دەتوانێت داوودەرمان

بدات، بەڵام ناتوانێت شیفا بدات. دەتوانێت ناسیاوت پێبدات، بـەڵام ناتوانێت دۆسـتت بـداتێ. دەتوانێـت کـاتی خۆشـت پێبـدات، بـەڵام ناتوانێت دڵخۆشیت بداتێ."

ئایا هەر پارە وایە؟ سەرچاوەکانی تری هێز و هۆکارەکانی دیکەی کەیف و سـەفاش، بـە هـەمان شـێوە نـــــــــاتوانن دڵخۆشـــــییەکی ڕاسـت و نـەبڕاوە بە مرۆڤ ببەخشن. هـەر بۆیـە زۆرێـك




لەو ناودارانەی کە لە هەموو ناز و نیعمەت و خۆشییەکدان نوقمی خەم و خەفـەتن. موشـتەری هەمیشـەیی پزیشـکەکانی ڕۆح و نەخۆشـییە دەمارییەکان لەم جۆرە کەسانەن. تەنانەت لەدوای زۆرێك لـەو کەسـە بەناوبانگ و زەنگینانە نامەی وا بەجێ دەمێنێت کە ئەوەی تێدا ڕوون دەکەنەوە بەدەست ژیانی هەبوونی و ڕەفاهییەت ناڵاندوویانە و چـیی تر حەزیان بە ژیان نـەماوە... چونکە ئـەو ژیانـەیان کـە خـەڵکی لـە دوورەوە ئێرەیـی پێدەبـەن و خۆزگـەی پێـدەخوازن لای ئـەوان هـی تەحەممول کردن نییە، هەر بۆیەش پەنا دەبەنە بەر خۆکوژی.

# سەرەکیترین خۆراکی ڕۆحمان

کەواتە هەر ئەوە بەس نییە هەڵبسین بە خۆراك پێدان و گەورە کردنی لایەنی ماددیمان –کە جەستەمانە–، بەڵکو پێویستە لایەنی مەعنەویشمان –کە ڕۆحمانە– بەخێو و گۆش بکەین. ئەگەر سەرەکیترین خۆراکی جەستەمان نان و ئاو بێت، ئەوە سەرەکیترین خۆراکی ڕۆحمان سەرەتا باوەڕ و پاشانیش پەرستش و بەندایەتییە. وەك چۆن ئەگەر جەستە خۆراکی پێویستی پێنەدرێت سیس و کورتەبنە دەردەچێت، ڕۆحی بێخۆراکیش بێهێز و لاواز دەردەچێت.

ئەو مرۆڤەی کە ڕۆژیی سێ ژەم خواردن شۆڕ دەکاتەوە گەدەی، ئایا ئەوە ڕاستە هیچ بیرێك لە خۆراکی ڕۆحی نەکاتەوە؟ ئێ پێویستیی ڕۆژانەی ڕۆح و دڵیشمان پێنج فەرزە نوێژە. ئەو کەسەی بەهۆی نوێژەوە دەچێتە دیداری خودا ڕۆحی بە ئاسوودەیی دەگات. ناخی لێوان لێو دەبێت لە خۆشی. بەهۆی ئەو مۆڕاڵە بەرزەی لە بەندایەتی و پشت بەستن بەو کردگارەی توانا و زانینی بێکۆتایە دەستی دەکەوێت، لە هەموو کێشە و چەرمەسەرییەك دەربازی دەبێت. لە ژیاندا پتر دڵخۆش و سەرکەوتوو دەبێت. بەم جۆرە نوێژ بۆ موسوڵمانی باوەڕ تۆکمە ئەو پەنجەرە نوورانییەیە کە ڕۆح هەناسەی لێوە وەردەگرێت.

پێویستە هەر لە تەمەنی منداڵییەوە دەست بدرێتە ئەو خۆراکە سەرەکییەی ڕۆح و پابەندی لێکردنی، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی لێڕاهاتنی... نابێت وەك ئەو کەسانە بوترێت کە بە هەڵە بیردەکەنەوە و دەڵێن: "با خانەنشین بم، ئەوسا دەست بە پەرستشەکان دەکەم"...

(ئەسلی) داوای مۆڵەتی کرد و وتی:

— مامۆستا! پێویستە لە تەمەنی چەند ساڵییەوە دەست بە نوێژ بکرێت؟

— بۆ نوێژ و ئەرکە ئاینییەکانی تر مەرج گەیشتنە تەمەنی پێگەیشتنە. واتە پێویستە لە تەمەنی منداڵی دەرچووبێت و پێت نابێتە تافی گەنجی. بێگومان ئەمەش لە هەموو کەسێکدا لە هەمان تەمەندا نییە. زانایان ئاماژەیان بەوە داوە کە لە ڕووی ئاینییەوە بەرپرسیارێتی لە کچاندا لە تەمەنی (٩—١٥) ساڵان و لە کوڕانیشدا لە تەمەنی (١٢—١٥) ساڵییەوە دەست پێدەکات.



● ئەوەی کە هەموو جۆرە سەرچاوەکانی هێز و هۆکارەکانی خۆشی ناتوانن دڵخۆشیی ڕاستەقینە و نەبڕاوە بە مرۆڤ ببەخشن، لەوەدا دیارە کە ژمارەی تووشبووانی نەخۆشییەکانی دەمار و ڕۆح ڕۆژ بە ڕۆژ لە بەرزبوونەوەدایە.

بەم وەڵامە پۆل گرژیی تێکەوت. ژمارەی ئەوانەی دەیانویست قسە بکەن زیادی کرد. هەندێکیش کەوتنە فسکە فسك. بەتایبەت محەمەدی فەیلەسووف کە کەمێکیش توورە بووبوو:

– مامۆستا! بۆچی وا دانراوە کچان زووتر دەگەنە تەمەنی پێگەیشتن؟

هەرچی کچەکانیشە وەزعەکەیان بەدڵ بوو و بزەیان دەکرد، دیاربوو ئەمەیان بە نیشانەی باڵایی دادەنا.

وتم:

– چونکە کچان زووتر گەورە دەبن و پێدەگەن. کوڕان کەمێك دێرتر پێدەگەن.

دڵخۆشیی کچەکان ئەوەندەی تر زیادی کرد و بە جۆرێك لە کوڕەکانیان دەڕوانی وەك ئەوەی بڵێن: "ئحم!"، بەڵام لە درێژەی قسەکانمدا کوڕە قوتابییەکانیش خۆشییەکی هاوشێوەیان چەشت.

وتم:

– ئەوە هەقیقەتێکە کە کچان زووتر پێدەگەن، بەڵام ئەوەش هەقیقەتێکی ترە کە ئەو پێگەیشتنانەی زووتر دەستپێدەکەن، زووتریش بە کۆتا دێن. کوڕان کەمێك درەنگتر دەگەنە تەمەنی پێگەیشتن، وەلێ پێگەیشتنەکەیان درەنگتر لە هی کچان کۆتایی پێدێت. کردگارمان وەك چۆن لە هەموو بوارێکدا هاوسەنگیی ڕاگرتووە، لەمەشدا هەر وای کردووە.

لەم نێوەندەدا چاودێری پۆل قەڵەم و کاغەزی بەدەستەوە بوو و کەوتبووە حیسابات. لێم پرسی: "ئەوە خەریکی چییت؟". بە کەمێك سڵەمینەوە باسی لە حیساباتەکەی کرد:

– مامۆستا! یەکێك لە تەمەنی ٧٥ ساڵی بمرێت، مانای وایە تێکڕا ٦٠ ساڵ پەرستشی لەسەر بووە، بەو پێیەش ١٠٩٥٠٠ نوێژی لەسەر بووە. ئەمە ژمارەیەکی گەلێك گەورەیە. مرۆڤ چۆن ئەو هەموو نوێژەی پێدەکرێت؟

سەرنجی قوتابییەکان زۆر زیادی کردبوو. وتم:

– با کاکەی چاودێر حیساباتێکی تریشمان بۆ بکات. ئەوسا منیش بۆتانی ڕوون دەکەمەوە کە چۆن دەتوانرێت زۆر بەئاسانی ئەو هەموو نوێژە بکرێت.

ئەو حیساباتەی دەمویست بیکات ئەوە بوو: یەکێك ٧٥ ساڵ بژی تێکڕا چەند نان دەخوات و چەندیش ئاو دەخواتەوە.

کە وانەکە تەواو بوو، گشت قوتابییەکان لەگەڵ چاودێردا بەجۆشەوە کەوتبوونە سەر حیساب کردن.

## حیساب و کیتابی تەمەنێکی ٧٥ ساڵی

چاودێری پۆل بە حیساباتێکی وردەوە بۆ وانەی داهاتوو هاتبوو. شارەزایانی ئامار بە شێوەیەکی ورد ئەنجامی ئەو حیساباتەی ئێمە بەدوایەوە بووین، دەرهێنابوو. بەپێی ئەو حیساباتە: کەسێك کە ٧٥

ساڵ دەژی، تێکڕا ٥٠ تەن خۆراك دەخوات، ٤٠ تەن ئاو دەخواتەوە، ١٣٠ هەزار کیلۆمەتر ڕێ دەبڕێت و ٩٠ ملیۆن وشە دەئاخفێت.

١٨ ساڵ بەپێوە دەوەستێت، ٢٥ هەزار (ئەسپە توانا) وزە بەکاردەبات و ٣٠٠ تەن قورسایی هەڵدەگرێت. ١٠٥ ڕۆژ لە ئاودا دەمێنێتەوە. ٢٠ تەن ئارەقە، ٥٠ تەن لیك، ٧٠ تەن میز و ٨٠ تەن پیسایی دەردەدات.

کەسێك کە ٧٥ ساڵ ژیان بەسەر دەبات، ٢٦ساڵی ئەو ماوەیە بە خەو دەباتە سەر.

ئەم ژمارانە، هەندێکیان بە لێڕامان و هەندێکیشیان بە خەندە پێشوازیی لێدەکرا، چونکە سەرەتا ئەوەندە بەگەورە دادەنران، وەك ئەوەی جێی باوەڕ نەبن. بۆ نموونە: خواردنی ٥٠ تەن خۆراك لەلایەن کەسێك کە ٧٥ ساڵ بژی، چیی دەگەیاند؟ ئەی ئەو هەموو لیك دەردانە؟ بەڕاستی جێی تێڕامان بوو...

- ئێستا بیرێك بکەوە: ئەگەر من ٧٥ ساڵ بژیم، پێویستم بە چەندین تەن خواردن و خواردنەوە هەیە. ئەمە گەلێك زۆرە. ئایا دەڵێیت: چۆن ئەم هەموو ئاو و خواردنەم پێدەخورێت؟ ئایا ئەمەت پێگەلێك زەحمەت دەبێت و بەو هۆیەشەوە دەست لە خواردن و خواردنەوە بەر دەدەیت؟

- نەوەڵڵا مامۆستا! دەستیان لێبەرنادەم.

- بۆ؟

– چونکه بەردەوام برسی و تینوو دەبم، کەواتە بەردەوام پێویستم بە خواردن و خواردنەوە هەیە. ئەگەر نەخۆم و نەخۆمەوە، نازیم...

– زۆر باشە، با بگەڕێینەوە سەر باس و خواسەکەی وانەی ڕابردوومان. **ئایا دەتوانین بڵێین ١٠٩ هەزار و ٥٠٠ نوێژ گەلێك زۆرە و لە تواناداا نییە؟**

– نەخێر، ناتوانین.

– کێ هاوڕای چاودێرە، با دەستی بەرز بکاتەوە.



● کەسێك ٧٥ ساڵ بژی، ٥٠ تەن خۆراك دەخوات و ٤٠ تەنیش ئاو دەخواتەوە. بە تێکڕا ١٣٠ هەزار کیلۆمەتر ڕێ دەبڕێ، ٩٠ ملیۆن وشە دەئاخفێ. ١٨ ساڵ بەپێوە دەوەستێت و ٢٥ هەزار ئەسپە توانا وزە بەکاردەبات. ٣٠٠ تەنیش قورسایی هەڵدەگرێت.

گشت پۆلەکە لەسەر هەمان دید یەکیان گرتبوو.

– بۆچی ناچارین ئەو ژمارە زۆرە نوێژە بکەین؟

ئیتر وەڵامەکان یەك بە دوای یەکدا دەهاتن:

– چونکە نوێـژ خـۆراکی ڕۆحمانـە. ئـەویش پێویسـتی بـە خـۆراك پێدانە.

– خۆ ئەو هەموو نوێژە لە یەك کاتدا، لە یەك ڕۆژ و لە یەك ساڵدا ئـەنجام نـادرێن... ڕۆژی پێـنج جـارە، واتـە پـەیتا پەیتایـە، بۆیـە بەئاسانی ئەنجام دەدرێن.

بەڵام سەرنج ڕاکێشترین وەڵام، هەمـدیس محەمـەدی فەیلەسـووف دایەوە:

– مامۆستا! خـۆی لـە خۆیـدا تێگەیشـتن لەمـە فـرە ئاسـانە. بـە شێوەیەکی کورت و پوخت دەتوانین ئاوا بیربکەینەوە:

کێ گەرەنتیی ئەوەی هەیە ٧٥ساڵ بـژی؟ ئـەوە چاودێرەکەمانە حیساباتی ٧٥ ساڵ دەکات. بە چی دەزانێـت ئەوەنـدە سـاڵە دەژی؟ ناکات دانوستانێکی ژێربەژێریی لەگەڵ فریشتەی گیانکێشان کردبێت؟

بەو پێیەی کەس لەم دونیایەدا نازانێـت چـەندە دەژی، مـرۆڤ وەك چۆن بـە خـواردن و خواردنـەوە جەسـتەی بـەخێو دەکـات، پێویسـتە ڕۆحیشی بە پەرستش تێر بکات. بۆ بە جۆرێك حیسابات دەکـات وەك ئـەوەی ٧٥ سـاڵ دەژی و لـە ئێسـتاوە بـە بیرکردنـەوە لـەوەی ئـەو هەموو پەرستشەی لەسەرە خۆی تێکدەدات؟ لەبری ئەوە، بـیر لـەوە

بکاتەوە کە ڕەنگە ساڵی داهاتوو، پێنج ساڵی تر، دەی تر، یان تەنانەت سبەی بمرێت و بیر لە خۆئامادەکردن بکاتەوە بۆ ڕۆژی دوایی چاکتر نییە؟

ئەی ئەوە نییە پێغەمبەریشمان (دروودی خودای لێبێت) دەفەرموێت: **"بە چەشنێك کار بۆ دونیا بکەن وەك ئەوەی قەت نامرن، بۆ دواڕۆژیش وا کار بکەن وەك ئەوەی سبەی دەمرن"**

– ئافەرین، محەمەد! باشمان پێکاوە کە بە فەیلەسووف هەڵمانبژاردوویت. بێگومان ئێمە وەك مرۆڤ هیچ گەرەنتییەکمان لە بەرانبەر مردندا نییە. ئەگەر ئوتوویەك، بەفرگرێك، ئامێری جلشۆرێك لەگەڵ ژیانی ئێمە بەراورد بکرێت، دەکرێت پتر بە گەرەنتیدار دابنرێت، چونکە ئەوان ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت «گەرەنتینامە»یان هەیە. هەر چی ئێمەین، بۆ ڕۆژێك چییە، گەرەنتیمان نییە. کەوابوو حیساباتکردنی نوێژەکانی ئەوەندە ساڵە، ڕاست نییە! خۆ ئەگەر ڕاستیش بێت ئەوە لەبەر ئەوەی بە قیست دەکرێت و، لەبەر ئەوەش کە خۆراکی ڕۆحمانە بە چەشنێك کە بە هیچ جۆرێك ناکرێت دەستی لێ بەربدرێت، گەلێك سوودی بۆمان هەیە.

## بۆ لە نوێژ وەڕس نابین؟

کەسێك ئەقڵ لە مێشکیدا بێت لە کارێکی خۆش و بەسوود وەڕس دەبێت؟ ئەگەر کارەکە قازانج و خۆشیی تێدا بێت و لەگەڵ ئەوەشدا کارێك بێت کە پێویستیمان پێی بێت، ئەوە هەر چەندە دووبارە ببێتەوە و زوو زوو دابێت مرۆڤ هەست بە بێزاری ناکات لێی.

– وەك کەمێك لەمەوبەریش ئاماژەی پێدرا، ئایا کەس هەیە لە سێ ژەم نان خواردن وەڕس ببێت و بەو هۆیەشەوە وازی لێبهێنێت؟

– کەس هەیە لە تەماشاکردنی هەموو ئێوارانی تەلەفزیۆن وەڕس ببێت؟

**کەواتە مرۆڤ لە شتێك کە زەوقی لێی بێت و خۆشیی لێ ببینێت یان پێویستیی پێ بێت نە بێزار دەبێت نە وەڕس.**

بۆیە بۆ ئەوەی چێژ لە نوێژ وەربگرین و لێی بێزار نەبین، بەر لە هەر شتێك دەبێت لە ماناکەی بگەین: نوێژ، پەرستشێکە کە خودای گەورە داوای لێکردووین و مانایەکی زۆر فراوان و قووڵی هەیە.



● مرۆڤ چێژ لە شتێك وەربگرێت، لێی بێزار نابێت...

١- نوێژ پەرستشێکە لە ڕێیەوە ڕۆحمان هەناسە وەردەگرێت و دڵمان لە ڕووی مەعنەوییەوە بەهێز دەبێت و هەستەکانمان بەرز دەبن. لەبەر ئەوەی خۆراکی سەرەکیی ڕۆحمانە، بۆ تەندروستیی ژیانی مەعنەویمان پێویستمان پێیەتی.

٢- نوێژ بەهۆی ئەوەی ڕۆژی پێنج جار مرۆڤ دەباتە حزووری خودای گەورە، خاوەن کاریگەرییەکی بەهێزە لە بەدوور گرتنی مرۆڤ لە گوناه و خراپەکارییەکان. کەسێك بە ڕاستی باوەڕی بەوە هەبێت کە بەهۆی نوێژەوە دەچێتە حزووری خودا چۆن کاری خراپ دەکات؟ ڕۆژی ٥ جار لە حزووری خودادا دەست لەسەر دەست دابنێیت، لەولاشەوە بە

خەیاڵ تەختییەوە ئەوەی ئەو قەدەغەی کردووە ئەنجامی بدەیت، دەبیٚ؟! ئەمە جێی قبووڵ نییە.

یەکێك نوێژ بکات و لەو لاشەوە ئەو کارە بەدانەی خودا قەدەغەی کردوون بکات، مانای وایە نوێژەکەی لە مانا هەقیقییەکەی دوورە. چونکە زاتی خودا لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الصَّلاَةَ تَنْهَى عَنْ الْفَحْشَاءِ وَ الْمُنْكَرِ﴾ العنكبوت: ٤٥، واتە: « نوێژ ئادەمزاد لە کاری خراپ و ناپەسەند ئەگرێتەوە.»

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە نوێژ کۆسپێکە، تاك و کۆمەڵ لە هەموو خراپەکاریی و پیس و چەپەڵییەك دەپارێزێت.

٣- نوێژ پەرستشێکە باوەڕ دەپارێزێت و بەهێزی دەکات. نووری ئیمانی نێو دڵانمان بە نوێژ پارێزراو دەبێت و بگرە پرشنگدارتریش دەبێت. نوێژ لە دوای باوەڕ گرنگترین قەرزی بەندایەتییە کە مرۆڤ بەرەو بەهەشت دەپەڕێنێتەوە. وەك بڵێی نوێژ دەخیلەی خێرە. بەرماڵەکان قاسەی پەرستشن، ڕۆژانە پێنج جار بەهۆی قازانجی مەعنەوییەوە پڕ پارەتر دەبن.

٤- نوێژ لە پەرستشەکانی تر بەنرخترە، چونکە لە نوێژدا خود و پوختەی گشت پەرستشەکانی تر هەیە.

لە نوێژدا ئەو سوورەت و دوعایانە دەخوێنرێن کە گوزارشت لە باوەڕمان دەکەن. ئەو گوزارشتانە لە نوێژدا بەکاردێنین کە بە جوانترین شێوە یاد و شوکرانەی خودا دەکەن و لەبەری دەپاڕێنەوە.

یادکردنەوەی پێغەمبەر (درووودی خودای لێبێت) بە جوانترین شێوە و دوعا کردن بۆ سەرجەم موسوڵمانان، هەمدیس لەناو نوێژدایە.

لە نوێژدا خواردن و خواردنەوە نییە بەمەش وەك ئەوەیە لە کاتی نوێژدا بە ڕۆژوو ببین.

نوێـژ زەکـاتی جەسـتە و ژیانمانـە. جـوانترین شـوکرانەی ئـەو خودایەیە کە تەندروستی و تەمەنی بۆ ژیان پێداوین.



● نوێـژ خـاوەن قووڵییـەکی وایــە کــە گشــت شـێوازەکانی پەرستشی گیانـەوەرەکانی تـری لــــەخۆگرتووە. بەشـــێکی زینـدەوەران بـە پێـوە (قیـام)، بەشـێکی تریـان بـە چـەمانەوە (رکووع) و بەشێکی تریشیان بە خۆدانــە زەویـــدا (ســجود) پەرستشی خودای گەورە دەکەن. مــرۆڤیش لــە نوێــژی خۆیــدا ســـەرجەم ئـــەم شـــێوازانەی پەرستش لێکدەدات.

لــە نوێــژدا ڕوو لــە کەعبــە دەکــەین.

مانای وایە ڕوو دەکەینە هەواری پەرستشی حەج.

بەم جۆرە نوێژ ئەو پەرستشە گشتگیر و قـووڵ و بنکـە فراوانەیـە کـە نموونەیـەکی بچـووکی لـە سـەرجەم پەرستشـەکان لـە خـۆدا گردکردووەتەوە.

٥- نوێژ خاوەن قووڵییەكی وایە كە گشت شێوازەكانی پەرستشی گیانەوەرەكانی تری لەخۆدا كۆكردووەتەوە. بۆ نموونە: یادی خودا لای درەخت و ڕووەك و ئاژەڵە دوو پێیەكان بەپێی تایبەتمەندیی خۆیان بەپێوەیە. چوار پێیەكان بە خۆ چەماندنەوە، خشۆكەكان و هەندێك لە ڕووەكەكانیش بە ڕاكشاوی یادی خودا دەكەن. ئەوەتا بەپێی گوزارشتی قورئانیش: ﴿وَإِن مِن شَيْءٍ إِلاَّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾ الإسراء: ٤٤، واتە **« هەر حەوت ئاسمانەكان و زەوی و هەركەسیان تێدایەو هەرچی شت هەیە هەموو تەسبیحاتی خودا ئەكەن.»**

مرۆڤ هەڵدەستێ بە كۆكردنەوەی شێوازە تایبەتییەكانی پەرستشی گشت بوونەوەرانی تر لە نوێژدا. ئەوەتا لە نوێژدا (قیام - بە پێوە وەستان)، (ركووع - چەمینەوە) و (سوژدە - سەر نانە سەر زەوی) هەیە. ئەمە لە كاتێكدا كە تەنانەت فریشتەكانیش بە یەك شێوە پەرستش دەكەن.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە مرۆڤ پەرستشی سەرجەم زیندەوەران لە نوێژدا كۆدەكاتەوە. بەم جۆرەش لە گۆشەنیگای پەرستشی گشت زیندەوەرانەوە دەبێت بە نوێنەریان لای خودای گەورە. ئەوەی نوێژ نەكات مانای وایە ئەم ئەركە مەزن و پڕ شكۆیەی نوێنەرایەتیی بەجێ نەهێناوە.

٦- ئەو كەسەی نوێژ دەكات ژیانی ڕۆژانەی دەخاتە ڕێكخستن و دیسپلینەوە. ئەوەی كە لە كاتی دیاریكراودا دەست نوێژ هەڵدەگرێت

و دەچێتە دیداری خودا، ناچار دەبێت پلان بۆ کات و کارەکانی دابنێت و خۆی لە بێسەروبەری ڕزگار بکات. کەسێك ژیانی ڕۆژانەی بۆ پێنج بەش دابەش بکات، ئاگای لە تێپەڕ بوونی کات دەبێت. ئاگای لەوە دەبێت کە لە بەیانی، نیوەڕۆ، عەسر، ئێوارە، خەوتنانداییە. بەم جۆرەش باشتر لە بەهای ئەم کاتانە دەگات.

هەر یەکێك لە پێنج فەرزەکە شتی خۆش خۆش بەبیری مرۆڤ دێنێتەوە:

نوێژی بەیانی دەڵێت: "ئەی موسوڵمان! وریا بە! وا ڕۆژت دەست پێدەکات. نییەتی ئەوە بێنە پابەندیی لە فەرمانەکانی ئەو خودایە بکەیت کە لەم بەرەبەیانەوە هەڵساویت بۆ دیداری و بە دەستی کراوەوە لێی دەپاڕێیتەوە. خاوەن بڕیار و هیممەتبەرز بە لە کردنی کارە چاکەکان و خۆدوورگرتن لە خراپەکان. ئەم ڕۆژەی کە بە پەرستشی خودا کردوودەتەوە، با بە کار و کردەوەگەلێك لێوان لێو بن کە جێگەی ڕەزامەندیی ئەو بن. دەی ئەمڕۆت پڕ فەڕ بێت!"

نوێژی نیوەڕۆ هۆشیاری دەداتە مرۆڤ: "ئاگادار بە! نیوەی ڕۆژەکە تێپەڕی، ئایا ئەو کارە چاکانەی دەمەو بەیان بڕیارت لێدان بەجێتهێنان؟ ئەی لە خراپەکارییەکان خۆت بەدوور گرت؟ ئەگەر دەستت بە ئەنجامدانی بڕیارەکانەوە گرتووە ئافەرین بۆت. بەردەوام بە لەسەر بەدەست هێنانی خێری زیاتر... خۆ ئەگەر بەردەوام

نـەبوویت لەسـەر دەسـتپێکە جوانەکـەی بـەیانی، حـەیف! هـەر هـیچ نەبێت نیوەی دووەمی ڕۆژەکەت بنرخێنە."

هەر چی نوێـژی عەسریشـە، ئـەوەت بـیر دەخاتـەوە کـە خـەریکـە ڕۆژەکـەت کۆتـایی پێـدێت. دەڵێـت: "دەی بجـووڵێ. خەریکـە ئـەمڕۆ دواییـی دێـت. کەموکوڕییـەکانت تـەواو بکـە. کـاری ڕۆژت مەخـەرە شەو".

لەگەڵ نوێژی ئێوارەدا ڕۆژ بە کۆتا دێت: "لە کۆتـایی ڕۆژێکدایت. حیسابی خۆت بکە بزانە لە سـەر زەرەریـت یـان قـازانج؟ ئەگـەر ئـەو کارە جوانانەت کە لە مرۆڤـ دەوەشـێنەوە زۆرینـەن، پـیرۆزە... خـۆ ئەگەر گوناهەکان قورستر بن، مەخابن و عەیبە بۆ تۆ.

کەسـێك ڕۆژی پێـنج جـار بچـێتە دیـداری خـودا بـە چ ڕوویەکـەوە گوناه دەکات؟ ئەریێ بیرێك لـەوە ناکەیتـەوە ڕۆژێـك لـە دەرگـای گـۆڕ دەدەیـت و لـەو دونیـا لـە تـاریکیی گوناهـەکانت سـزای خـۆت وەردەگریت؟

ئەو کارانەی لە ڕۆژدا پێـت نـەکراون، هـەر هـیچ نـەبێت لـە شـەودا بیانکە."

نوێژی خەوتنان دوا هۆشیاری دەدات:

"ئەوە ڕۆژێکت کۆتایی پێهـات. حیسـاباتێکی ئـەو بیسـت و چـوار سـەعاتەت بکـە. بزانـە لـە شـەو و ڕۆژێکـدا گوناهـەکانت زیـاترن یـان

چاکەکان؟ ئەگەر چاکەکان زیاترن، نییەتی ئەوە بێنە سبەینێ زیاتریان بکەیت.

خۆ ئەگەر گوناهەکان زیاترن، بە پەشیمانی و تۆبەوە ڕوو لە سبەی بکە."

بەم جۆرە پێنج فەرزەکە توانای بەسەر خۆدا زاڵ بوون بە مرۆڤ دەبەخشن. مرۆڤ بەهۆی کارەکانییەوە خۆی دەخاتە بەردەم لێپرسینەوەوە.

٧- نوێژ کە لە ڕووی مەعنەوییەوە دەمانشوات و پاکمان دەکاتەوە، دڵ و ڕۆح و ناخمان بە بریقە دێنێت وا لە مرۆڤ دەکات شایانی بەهەشت بێت.

٨- کەسی نوێژخوێن، هەموو ئیش و چالاکییەکانی تریشی دەبن بە پەرستش. ئەو کارەی بۆ دەستەبەر کردنی بژێوی دەیکات، بۆی دەبێت بە پەرستش. بۆ نموونە: بەقاڵێکی باش، هەموو کارە کەسییەکانی وەك کێشانی ڕزق و فرۆشتنیان و خاوێن کردنەوەی دوکانەکەی، هەمووی دەچنە خانەی پەرستشەوە و خێری بەدەست دەخەن.

مانای وایە، نوێژکەرێك دەتوانێت وا بکات هەموو ژیانی خۆی بکاتە پەرستش و لە ڕێیەوە چاکە بە دەست بهێنێت. هەڵبەتە بەو مەرجەی کە هەموو ئەو کارانە لەگەڵ فەرمانەکانی خودادا کۆك بن.

٩- پەرستشەکان و لەپێشی هەمووشیانەوە نوێژ باوەڕمان بەهێز و تۆکمە دەکەن. ئەو باوەڕەی لە ڕێی نوێژ و پەرستشەکانی ترەوە پتەو نەکرابێت لاواز دەبێت و توانای لەدەست دەدات.

١٠- گشت پەرستشەکان و لەناویشیاندا نوێژ، تەنها بۆ خودای گەورەن. ڕۆحی نوێژ ئیخلاسە. واتە ئەنجام دانی تەنها و تەنها لە پێناوی خودادا. ئەگەر لە پێناوی هۆ و سوودێکی تر بکرێت خێری کەم دەبێتەوە. ئەوەش شتێکی حەتمییە کە نوێژ گەلێك سوودی ماددی و تەندروستییشی هەیە.

به رای فەرەنساییەکان
چارەسەری ڕۆماتیزم پێنج
فەرزە نوێژە.

CUMA/DIN

Fransızlara göre
romatizmanın
ilacı 5 vakit
namaz

● برگەی ڕۆژنامەیەك کە سوودی نوێژ بۆ تەندروستی دەردەخات.

## سوودە ماددی و تەندروستییەکانی نوێژ

نزیکەی سی و پێنج ساڵێك لەمەوبەر (پێش ١٩٨٥- وەرگێڕ) بەرنارد شۆ - کە نووسەرێکی زۆر بەناوبانگی ئینگلیزە- دەڵێت:

"نوێژی موسوڵمانان، لە ساڵی

(٢٠٠٠)دا له ڕاچێتەی پزیشکه پرۆفیسۆرەکاندا جێدەگرێت."

بۆ بینینی نوێژ وەك چارەسەر و شیفا لە ڕاچێتەی پزیشکە گەورەکان، پێویست بەوە نەماوە تا ساڵی ٢٠٠٠ چاوەڕێ بکرێت. تەنانەت پزیشکە ناموسوڵمانەکانیش بە شێوەی جۆراوجۆر ئامۆژگاریی نەخۆشەکانیان دەکەن نوێژ بکەن. ئەو هەواڵەی کە لە ژمارەی ڕۆژی ٨ی ئەیلوولی ١٩٨٣ ی ڕۆژنامەی «گونایدن»دا بڵاوکراوەتەوە یەکێکە لەمانە:

" بە ڕای فەڕەنساییەکان، چارەسەری ڕۆماتیزم پێنج فەرزە نوێژە."

پزیشکە فەڕەنساییەکان لە پاریس ئامۆژگاریی ئەو نەخۆشانە دەکەن کە بە دەست ڕۆماتیزم و ئازاری کەلەکە و پشت دەناڵێنن، وەك موسوڵمانان نوێژ بکەن. ئەو پزیشکانە ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە کردنی نوێژ ڕۆژی پێنج جار، زۆر باشە بۆ کەم کردنەوەی ئازاری ڕۆماتیزم، هەر وەك ئاماژە بەوەش دەدەن کە ئەو جووڵانەی لەمیانەی نوێژدا ئەنجام دەدرێن چاکترین جووڵەی جومناستیکین.

پزیشکە فەڕەنساییەکان جەخت لەوە دەکەنەوە کە ئەو جووڵەیەی نوێژ کە لەمیانەیدا ڕووەو زەوی خۆ دەچەمێنیتەوە و دواتر هەڵدەستیتە سەر پێ ئازاری کلاوەی ئەژنۆ ناهێڵێت. کڕنووش بردنیش بەتایبەتی بۆ بەهێزکردنی ماسوولکەکانی پشت زۆر بەسوودە."

ڕۆڵی نوێژ لە پاراستنی تەندروستیدا هەر لەمەندەدا قەتیس نامێنێت، بەڵکو:

١- ئەو ڕاهێنانانەی لە وڵاتانی بیانیدا بە چاودێریی پزیشکە بەناوبانگەکان بۆ گەنجی و چوست مانەوە بە خەڵکی ئەنجام دەدرێن بە تەواوی لە نوێژ دەچن.

٢- بە سەرنانە سەر زەوی تەوژمی خوێن بۆ مێشك زیاد دەکات. ئەم جووڵەیە وەك جومناستیك وایە بۆ دەمارەکانی مێشك. هەر بۆیە تەنانەت لە وڵاتە گەرمەسێرەکانیشدا، خوێن بەربوونی مێشك لەنێو موسوڵمانانندا بەدی ناکرێت.

٣- سەر جووڵاندن و بادانی بۆ ئەملا و ئەولا، بەر لە ڕەقبوونی مل دەگرێت. تورکێك کە بۆ چارەسەری ملڕەقی چووبووە هەندەران، پزیشکێکی ئەڵمانی پێی وتبوو:

"ئایا موسوڵمانیت و دەتوانیت نوێژ بکەیت؟ ئەگەر نوێژ ناکەیت، وەك ئەوەی لە نوێژدا هەیە ڕۆژی پێنج شەش جار سەرت بەتەواوی بۆ ئەم لاو ئەولا تا ئەوەندەی دەسووڕێت، بسووڕێنە."

٤- جووڵاندنی پشت و هەڵسانە سەر پێ، بێ خۆ دانە پاڵ هیچ شتێك، گورجی و لەش سووکی بە مرۆڤ دەبەخشێت.

٥- لە گرنگترین سوودە تەندروستییەکانی نوێژ ئەوەیە کە زەینمان لە هەموو جۆرە کاروبارێك و بیرکردنەوەیەك لە دونیا دوور دەخاتەوە و لە تەنها خاڵێکدا کۆی دەکاتەوە. ڕاهێنانی زەین لەسەر تەرکیز

کردنــە ســەر یــەك خــاڵ، ئــەو ڕێگــە چــارەیەیە کــە نەخۆشــخانە پێشــکەوتووەکان بـۆ چارەسـەری بیرکـۆڵی بەکاریدەهێنن.

٦- سـوودێکی فـرە گرنگـی دیکـەی نوێـژ ئەوەیە، کە وا لە مرۆڤ دەکات بەیانیان زوو لە خەو هەڵبسێت. سوودێکی تەندروسـتیی ئەمــەش ئەوەیــە، مرۆڤــ زووتــر خــۆی لــە ژەهــرە کەڵەکــە بووەکـانی لەشــی (میــز و پیســایی) ڕزگــار دەکــات. لــەنێوان ئــەو کەسەی سەعات پێنج لە خەو هەڵدەستێت و ئەوەی سەعات هەشت هەڵدەستێت، سێ سەعات جیاوازی هەیە. مانای وایـە ئـەوەی پێویســـتە فـــڕێ بدرێتـــە دەرەوە، ســـێ سەعات زیاتر لە جەستەدا دەمێنێتەوە، بەو هۆیەشەوە کەمێك تێکەڵ بە خوێنی دەبێت.



● نوێــژ باشــترین وەرزشــە کــە بەدرێــژایی ژیــان و بــە هــەموو کەسێك - پیر و گەنج، دەکرێت.

٧- وەرزش کردن بە درێژاییی تەمەن، ڕۆژ بە ڕۆژ لـە کـورتی دەدات. بەپێی ڕوونکردنەوەکانی نێوەنـدە پزیشـکییەکان، نوێـژ لـە سـۆنگەی دروستیی جەستەوە، بە وەرزشێکی تەواو دادەنرێت.

٨- زانایــان جــەخت لــەوە دەکەنــەوە کــە نوێــژ بەقــەد ســوودە جەسـتەییەکانی سـوودی بـۆ دروسـتیی ڕۆحـیش هەیـە. لـە ڕۆژگـاری

ئەمڕۆماندا مرۆڤایەتیی تووشی باهۆزێکی بەهێزی گومان و بێهیوایی بووە. ئەو داڕووخان و دواکەوتنەی لایەنی ڕۆحیی وەك پەتایەکی کوشندە لە بڵاوبوونەوەدایە. لە وڵاتە هەرە دەوڵەمەندەکانیشدا ئەو نۆڕینگانەی تایبەتن بە نەخۆشییەکانی ڕۆح و دەمار جمەیان دێت. ئەوانەی چارەسەر لە حەب و مەی و ماددە هۆشبەرەکان دەبینن ئەوەندەی تر حاڵیان شپرزە دەبێت. بەهۆی کەوتنە داوی بێمتمانەیی و ترسیان لە مەرگ پەنا بۆ خۆکوشتنیش دەبەن.

چارەسەری هەموو ئەم ناڕەحەتییانە بڕوا بوون و پشت بەستن بە خودا و پەنا پێگرتنیەتی. ئەمەش بە پەرستش - بەتایبەت بە نوێژ - دەبێت. نوێژ ئۆقرە و ئاسوودەیی بە ڕۆح دەبەخشێت. چونکە ڕۆح بۆ پەرستش بەدیهێنراوە، گەر لە پەرستش و نوێژ - کە لە پێداویستییەکانین- دوور بکەوێتەوە، هەست بە ناڕەحەتی دەکات.

لە (کۆنگرەی تەندروستیی ئیسلامی)دا، کە لە ئەیلوولی ١٩٨٤ لە شاری ئەستەنبووڵ گیرا، زاناکان جەختیان لەسەر ئەم ڕاستییە کردەوە. ئەوەشیان بە شێوەیەکی زانستی ڕوون کردەوە کە باوەڕ و پەرستشەکان بەهۆی ئەو میزاج و هێزەی بە مرۆڤی دەبەخشن، بەرگری بە مرۆڤ دەبەخشن لە تووشبوون بە نەخۆشی تەنانەت شێرپەنجەش. ئەو ڕۆحەی لە ڕێی نوێژ و پەرستشەکانی ترەوە پەنای نەبردبێتە بەر خودا، هیچ خۆشی و ڕابواردنێك لە باریدا نییە دڵنەواییەکی ڕاست و ڕیشەداری پێ ببەخشێت. هیچ شتێك جێی

پەرستش ناگرێتەوە. بیرکردنەوە لەمە بە قەدەر هەوڵدان بۆ بەگەڕخستنی ماشێنێك بە ئاو، هەڵەیە.

# پێڕست